# ئەفسانە و ئەدەب

## چەپکێ بەرهەمی تەرجەمەکراو
## لە
## عەرەبی و فارسییەوە

# ئەفسانە و ئەدەب

**چەپکێ بەرهەمی تەرجەمەکراو**
**لە**
**عەرەبی و فارسییەوە**

**وەرگێڕان بۆ کوردی**

**محەمەد حەمە باقی**

MUKIRYANI
ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

هەولێر - ٢٠١٣

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **ئەفسانە و تەم** (چەپکێ بەرهەمی تەرجەمەکراو لە عەرەبی و فارسییەوە)
- وەرگێڕانی: **محەمەد حەمە باقی**
- نەخشەسازی ناوەوە: **ڕێدار جەعفەر**
- بەرگ: هۆگر
- نرخ: (٢٥٠٠) دینار
- چاپی یەکەم: ٢٠١٣
- تیراژ: ٧٥٠ دانە
- چاپ: چاپخانەی موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (١٦٢) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٠٦)**



**هەموو مافێکی بۆ وەرگێڕ پارێزراوە**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێڕست

## پێشکەشکردن:

ئەم چەپکە بەرهەمە تەرجەمەکراوەی، ئێستا لە کتێبێکدا یەك دەگرنەوە، مێژووی تەرجەمەکردنی هەر یەکێکیان لەگەڵ ئەوانیتردا مەودایەکی لەنێواندا هەیە و هەریەکەیان لەکەش و هەوایەکی دەروونیی و ڕۆحیمدا، دڵبەستەیان بووم و بەشەق و تاسەی ئەو بارە دەروویني و ڕۆحیی ئەوکاتانەمەوە تەرجەمەکراون و لە دوای چاپ و بڵاوبوونەوەی هەریەکەشیان، لە قۆناغ و گۆڤاری جیاوازی کوردستانی خۆرهەڵات و باشووردا، لە ماوەی (٣٠) ساڵ تەمەنی بەناچاریی جێگۆڕکێ دژوارەی رابووردوومدا، بەرهەم و کتێبی ترم بەدوایاندا هاتوون و هەلیان بۆ رەخسا و بوونە کتێب و لەخەمی فەوتان و لانەوازبوونیان بوومەوە... بەڵام هەندێ بەرهەمی تری وەك نموونەی ئەم چەپکە بەرهەمەم، کە لەناو تەمی ئەو (٣٠) ساڵەدا، دەستەکوتێم بۆ دەکردن و بۆیان دەگەڕام، بەرودوا دۆزیمنەوە و بەسەرم کردنەوە، کە ئەگەر دیتنەوەیان کەمێك دژوار بووبێ، بەڵام دژوارتر لە مەش، دەبووایە پیایاندا بچمەوە و لەو کوردی نووسین و خولیای بەردەوام فێربوونەوە، لە دارِشتن و رستەسازیی هەندێکیان نیگەران و ناڕازیی بووم و پێم چاك بوو دەستکاریی و دارشتنەوەیان بکەم، بۆ ئەمەش دەبووایە دەقە ئەسڵییەکانیانم چەنگ بکەوێتەوە، کە مخابن بۆ دەقی یەکەمیان (ئەفسانەی ئەدۆنیس)، تەقەللایەکی زۆرم دا، بەتایبەتی سەرم لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر و سلێمانی دا و راسپێرییم بۆ کتێبخانەی دهۆکیش کرد و تکام لەزۆرینەی ئەو هاوڕێیانەشم کرد، کە پێم وابوو دەقی عەرەبی ئەو بەرهەمەیان لا دەست دەکەوێت، دەستم نەکەوتەوە و هێشتاش ئۆخژنی یەکجارییم لە دارِشتنی ئەمەیان نییە و دەبێ بەڕاشکاویی بڵێم ئەم ئاواتەم بۆ چاپێکی داهاتووی ئەم بەرهەمە

هەڵدەگرم، کە نازانم کەی دەبێت (هەروەك ناشـزانم کـەی ئـەم بەرهـەم تەرجەمـە کــردووە !). هەرچــەندە بــەبێ دەســت کەوتنــەوەی دەقــە عەرەبییەکەیشــی، پێداچوونەوە و دەستکارییەکی سەرومڕی دەقەکەم کردۆتەوە و پەیامی دەقەکەم بە روونیی و راستیی بەخوێنەران گەیاندووە، هاوکات خودی دەقەکەش، ئەوەنـدە بــەپێز و بــەهێزە، کــە خوێنــەر نــاتوانێ دەســتبەرداری خوێندنــەوەی ببێــت، بەتایبـەتیش کـە دەقـی نـاوبراو، پێوەندییـەکی نزیکـی بـە میتۆلۆژیـاو پێشـێنەی دەڤەرەکەی ئێمەوە هەیە.

هــەروەك هەریەکــە لــە بەرهەمــەکانی تــری ئــەم کتێبــە، بــەو مەبەسـتە هــەڵم بژاردوون، کە پێوەندییان بەلایەنێکی ژیانی ئێمەوە هەیـە، وەك چـیرۆکی (بەیـەك گەیشـتن)ی چـیرۆکنووس و رۆماننووسـی نـاوداری قـەرغیزی چـەنگیز ئایتمـاتۆف (١٩٢٦ ـ ٢٠٠٨): کــە گــەلێ تایبەتمەنــدیی کۆمەڵگەکــەیان، زۆر لــە کۆمەڵگــەی کوردەواریی نزیکە و هاوکات رووداوەکـانی جـەنگێك دەگێڕێتـەوە، کـە سـەرومڕی ئــەم (٥٠) ســاڵەی رابــووردووی ئێمــەش جۆرێکــە لــەو هــەزاران رووداوانــەی، کــە (چـەنگیز) لـەم دەقـەدا، نموونەیـەکی بچـووکمان بـۆ دەگێڕێتـەوە و هەنـدێ لـە پاڵەوانەکانی ناو ئەم چیرۆکە، گەلێ لەو هاوڕێیانەی خۆمم بەیاد دێننەوە، کە لـەم پەنجا ساڵەی دوایی تەمەنمدا، لە هەردوو شۆڕشی ئەیلوول و دوای ئەیلوولیش، بە بەرچاوی خۆمەوە و لە نزیك خۆمـدا، دەسـتی جـەنگ لێمـی رافڕانـدن و بـەردەوام لەگەڵ بیرەوەریی و یادیاندا دەژیم و دەژیم...

دیسان هەڵبژاردنی شـاعێرێکی بـەنامێی وەك (ئـەدۆنیس)یش، بـەو مەبەسـتەم هەڵبژاردووە، تا خوێنەری کورد، بەراوردێك لە تەك شیعری ئەم شاعیرە و شـیعری ئەو لەشکرە زۆرەی شـاعیرانی کـورد دا بکـات، کـە بەدەگمـەن و تـاك و تـەرا، لـە پشت شاعیرەکانیانەوە، رووناکبیریی و ژیارێکی وایان تێدا دەبینـرێ، حـەرفێکیان خستبێتەسەر خەرمانی سیعری (نالی) و (مەولەوی)... یان (گۆران) !.

دواجار هەڵبژارونی هەڤپەیڤینی نێوان دووکەڵە ناوداری وەك (گوتە)ی نـاوداری جیهــانی و (نــاپلێون)ی فەرمانــدەی لەشــکری فرەنســا، کــە لــەنێوان پێکــەوە ئاخاوتنیاندا، زەریایەك زانیاریی و رۆشـنبیریی هەسـت پێدەکـەیت و سـەرت لـەوە

سورِ دەمێنێ، کە (ناپلیۆن)ێکی داگیرکاری ئەو ڕۆژگارەی فرەنسا، کەلەکاتی ئەم ئاخاوتنەدا، ئەڵمانیای داگیرکردووە و بەو هەموو توانا و دەسەڵات و لەشکرە زۆرەیەوە، هەمووی بەلاوەناوە و خۆزگەی دیتن و دیداری ڕووناکبیرێکی وەك (گۆتە) دەخوازێ و لە زانست و نەخشەی داگیرکردنی وڵاتانەوە، دەچێتەناو دنیای ئەدەب و ڕووناکبیریی و بەتەریبی ڕۆشنبیریی (گۆتە)دا، لە ئەدەب و ڕەخنە و شانۆ و موزیك دەدوێ بەدەم خوێندنەوەوە، سەرنجی زانیارییەکانی (ناپلیۆن)ەوە، بیر لە عەقڵی داگیرکارانی کوردستان دەکەیتەو، کە لەکاتێکدا (ناپلیۆن) لەسەردەمێکی تردا، وڵاتی (میسر) دەگرێ، لەگەڵ خۆیدا تیپەکانی موزیك و ئۆپیرا، بۆ میسر دەبات و لەو ڕۆژگارە بەدواوە، بناغەی ئۆپێرا و موزیك لە میسردا هەڵدچنرێ و داگیرکارانی کوردستانیش، کیمیاباران و ئەنفال و جنێوساید و کاولکاریی هەزاران گوند و شارۆچکەی کورستان، بەدیاری بۆ کوردستان دێنن.

هیوادارم هەڵبژاردەکەم، پەیام و خزمەتی نیشتمانی گەیاندبێ.

**محەمەد حەمە باقی**

**٢٠١٣/١/٧**

**هەولێر**

# ئەفسانەی ئەدونیس

## پێناسێکی کورتی ئەم نووسینە:

(چڵە زێڕینە ـ الغصن الذهبـي) ناوی ئەو کتێبە بەناوبانگەیە کە ئەدیب و زانای ناسراوی ـ ئەنترۆپۆلۆجی ـ . (سیر جێمس فریزر) لە دوای ساڵی ١٩٠٠ەوە بە (١٢) بەرگ دەستی بە بڵاوکردنەوەی کرد... ئەم کتێبە، بە یەکێك لە دەستکەوت و رووداوە رۆشنبیرییەکانی سەدەی بیستەم دەژمێردرێ، چونکە هەر دوای بڵاوبوونەوەی، هەموو گەلان، بە پەرۆشەوە وەریانگێڕایە سەر زمانەکانی خۆیان و لە پاڵ ئەمەشدا، دیسان شاعیر و رۆماننووس و شانۆگەرنووس و چیرۆکنووسە گەورەکانی دنیا قۆستیانەوەو کردیان بە هەوێنی بەرهەم و زیندووکردنەوەی میرات و کەلەپووری مرۆڤایەتی..

ئەم کتێبە بریتییە لە بەسەرکردنەوەو توێژینەوەیەکی زانستییانەی هەموو ئەو ئەفسانە و نەریت و باوەڕو کەلتوور و جادووگەرییەی، لە رۆژە تاریکەکانی سەرەتای ژیانی هەموو مرۆڤایەتییەوە، تا دوای هاتنی ئایینی ((مەسیح)).. نرخی ئەم کتێبە لەوەدایە بە یەك چاو، نەرێت و داستان و ئەفسانەی پێشینانی هەموو نەتەوە و گەلان و ناوچەکانی سەر رووی زەمینی بەیەکەوە بەستووە... ئەمەیشی لەو لەو کڵاورۆژنەیەوە کردووە، کە هەموو مرۆڤایەتی، رۆشنبیرییەکی هاوبەشیان هەیە.

لەبەرئەوەش کە بەشی یەکەمی، بەرگی چوارەمی ئەم کتێبە، کە ناوی (ئەدونیس)ەو پیوەندییەکی راستەوخۆی بە ناوچەی رۆژئاوای ئاسیاو رۆژهەڵاتی

ناوەڕاستی ئێمەوە هەیە، بۆیە ساڵی ١٩٧٥ ئەدیبی ناسراوی عەرەب (جەبرا ئیبراهیم جەبرا) ئەو بەشەی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی.

منیش هەر لەو روانگەیەوە کە بەشی یەکەمی بەرگی چوارەم (ئەوی کە جەبرا وەریگێڕاوە) زۆر و کەم پێوەندی و خزمایەتی و نزیکایەتی (راستەوخۆ، یان لابەلا)ی لەگەڵ ئێمەی کورددا هەیە، بە پێویستیم زانی پووختەیەکی تێر و تەسەلی وەرگێڕمە سەر زمانەکەمان، بەو هیوایەی روناکبیرانی کوردیش، ئاوڕێك لەو ئەفسانە و داستان نەریت و باوەڕانەی، کەڵك لەلایەنە روناکەکەیان وەردەگیرێ، تۆماریان بکەن و لەفەوتان رزگاریان بکەن...

لەم چەند لاپەڕەیەدا ئەو بابەتانەی بە گرنگم زانیون، هەڵوێستەیەکی درێژترم بۆ کردوون، وەك لەو بابەتەی بە راگوزاریی و تیژ بەلایاندا تێپەڕ بووم.. خۆشم لە لادان و دووکەوتنەوە و پەراوێز پاراستووە، تەقەللاشم داوە سەرومڕی بابەتەکان بەیەکەوە گرێ بدەم.

## سەرەتا:

ئەو گۆڕانە گورج و تیژڕەوەی بەسەر دیمەنی ئەم زەوییەدا دێت، وا لە مرۆڤ دەکات، زوو هەڵوێستەیەك بکات و ئاوڕێك لەخۆی بداتەوە، کە ئەم شتانە چۆن وا بوون و چۆن وا زوو تێپەڕین! ئەم هەڵوێستەیە ئەنجام دەیباتەوە بۆ ئەوەی بڵێ: ئەو دیاردانەی پێشوو دەبووایە هەر وابوونایە، چونکە مرۆڤ لە سەدە تاریکەکاندا کاتێ چاوی لێ بێ زەریا و رووبار، دەیبەستێ.. ئەو سەوزایی و تەڕاییەی لەسەر زەوی هەیە، وشك دەبێ. یەکسەر بیری لەوە کردۆتەوە کە ئەمانە هێزێکی گەورە، یان دەسەڵاتێکی گەورە، دەیانبزوێنێ.. لەبەرئەوە دووربینیی کردووە و بۆئەوەی پریشکی ئەم هێز و دەسەڵاتە بەر ئەمیش نەکەوێ، بە چاکی زانیوە ئەم دەسەڵاتە بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، یان هەر هیچ نەبێ رایبێنێ بەو جۆرەی خۆی دەیەوێ... بۆیە پەنای بۆ ئەفسانە و جادوو، ئایین بردووە، تا هەرکاتێ پێویستی بە _ئاو_ بوو، باران ببارێنێ، پێویستی بەی "هەتاو" بوو، خۆر هەڵبێنێ، پێویستی بە "زاووزێی ئاژەڵ" بوو، زیادیان بکات... تا وردە وردە مرۆڤ خۆی گەیشتە عاستی

ئەو زانیارییانەی کە "رۆژهەڵهاتن و ئاوابوون، بەرەو دواهاتنی وەرزی بەهار و هاوین و پایز و زستان" لەپشت ئەم دیاردانەوەیە، ئەو هۆیانەش جۆرە دەسەڵاتێکن، پێیاندەوترێ: خواوەند. ئەم خواوەندانە ژن و مێرد دەکەن و زاووزێ دەکەن و دەمرن و دەژێنەوە.. کە دەمرن، کلۆڵیی و تاریکیی، زەوی لەئامێز دەگرێ، کە لە دایکیش دەبنەوە، پیتوفەڕ و ئاوەدانیی دێتەوە سەر رووی زەوی، هەر مرۆڤیش خۆی بۆ ئەم رووداوانە، بۆنە و وەرزی تایبەتی بۆ دروست کردوون، کە وەرزی قاتوقڕی بووە، ناوی ناوە: مەرگی خاوەند و شیوەنی بۆ گێڕاوە.

کە زیندووش بۆتەوەوە، ئاهەنگی بۆ گێڕاوە...

ئەم خاوەندانە ئەگەر قوربانی و چاکە، لەگەڵیان بکرێ، دڵیان نەرم دەبێ و بژێوی و پێویستی مرۆڤ بە دەست دەخەن. دڵیشیان ئازار بدرێ، رەشەبا و لافاو و قاتوقڕی و بێ بارانیی روو لە زەوی و مرۆڤ دەکات... ئالێرەوە مرۆڤ بۆ دڵڕاگرتنی ئەم خواوەندانە، ئەوەی لای خۆیەوە داهێنانەوە کە ئەم خاوەندە نێر و مێیانە لەیەك مارەبکات و بەم کارە بەردەوامیی ژیان و بەردەوامیی لەدایکبوون و زاووزێی داهاتوو.. دروست بکات. بەم جۆرە تیوری ئایینی، تێکەڵ جادووگەرێتی کرد.. ئیتر لە زۆر دەمێکەوە باوەڕکردن بە جادووکردن زۆر بە قووڵیی بە ناخی ئایینیدا چووە خوارەوە کەم ئایین هەن توابیێتیان خۆیان لەپرژ و تیشکی ئەم لایەنە پێ پارێزرابێ. لەبەرئەوە ئەم دوو لایەنە ناکۆکە، لەکاتی کارپێکردندا، هەمیشە بۆ مرۆڤی زانا و فەیلەسوف، بە دووفاقیی دەمانەوە...

ئەگەرچی ئەم دیاردەیە لەچاوی مرۆڤێکی ئاساییەوە، کەمتر خۆی دەنوێنێ، چونکە ئەمیان مەبەستی نییە ئەم دیاردانە شییبکاتەوە و گوێ بداتە ئەنجام، کەواتە ئەگەر هەموو کەس وەك فەیلەسوفەکە سەرنجی زەوی و گەردوون و رووداوەکانی ژیانی بدایە، مێژووی مرۆڤایەتی ئەوەندەی ئێستا پڕنەدەبوو لەو هەموو ناکۆکی و کوشتن و شەڕ و شۆڕ خوێن رشتنەی تا ئێستا روویانداوە.

لەو ئاڵوگۆڕە ئاشکرایانەی لە وەرزەکانی ناوچەی مام ناوەندیدا بە زەقی خۆی دەنوێنێ، مەسەلەس (رووەك)ە. هەرچەندە "ئاژەڵ"یش ئاڵوگۆڕی داوەتە رووەك. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو هەموو نەریت و شانۆگەری و رەوشت و خووانەیە،

که تێیدا بەوە دەشکێتەوە ئەنجام (بەهار) بگەڕێننەوە بۆ سەر زەوی.. لە پاڵیشدا ئەو پێوەندییە توندوقووڵەی لە نێوان رووەك و ئاژەڵدا هەیە.. ئەو پێوەندییە بنەمای نەریت و ئەفسانە و جەژن و خۆشی و ناخۆشییانەیە، چونکە زانیوێتی ئەم دووانە (رووەك و ئاژەڵ) مایەی بژێوی مرۆڤ و زیندەوارانن، هەتا دێت مرۆڤ لەژیاندا پێویستی پێیاندەبێت.. کەواتە تا مرۆڤ لە ژیاندا بێ، ئەم دووانەش بناخەی ژیانی مۆڤن. بۆیە ئاساییە کە مرۆڤ هەموو شتێکیان لە پێناودا بکات.. ئەم ئەفسانە و داستانانە، ئەوەندەی لە رۆژئاوای ئاسیادا باو بووە، لە هیچ جێگایەکی تری سەر زەویدا بەو شێوەیە نەبووە.. نیشانەکانی مرۆڤ و ژیانەوەی ساڵانەی رووەك و ئاژەڵیان (بەتایبەتی رووەك) لەژێر ناوی خواوەندی (ئۆزیرس و تەموز و ئەدۆنیس و ئایس)دا کردووە. بەم شێوەیە رووەکیان بە خواوەندێك زانیوە، کە هەموو ساڵێك دەمرێت و زیندووش دەبێتەوە.. ناوی ئەم خواوەندانە کە هەموویان لە ناوەڕکدا مەبەست لە مردن و ژیانەوەن، لە هەندێ جێگادا، تایبەت بوون بە جێگاکەوە. ئێمە لێرەدا ناوەکانی خواوەندی (ئەندۆنیس) و (تەمووز)مان مەبەستە، کە تایبەتن بەو جێگایانەوەی لێمانەوە نزیکن، واتە لە عێراق و سووریا و لوبنان و قوبرسدا.

لە سەرەتادا گەلانی (سامی) لە (بابل ـ عێراقی ئێستا و سوریا) خواوەندی (ئەدۆنیس)یان دەپەرست. دوای ئەمان لە سەدەی حەوتەمی پێش زایینیدا (گریك)ەکانیش ئەم نەرێتەیان لێ فێربوون... وشەی (ئەدۆنیس) لە بنەڕەت و رەسەندا (تەمووز) بووە، دوایی سامییەکان گۆڕیویانە بە (ئەدۆنیس).. وشەی (ئەدۆنیس) بەمانای: مەزن و گەورە و بەڕێز و کاك.. هتد دێت.

ئەگەر (تەمووز، یان ئەدۆنیس) لەسەرەتادا لەگەڵ ناوچەی سەر بە نەتەوەگەلی سامیدا پەرسترابێ ئەوا چەند هۆیەك هەیە کە دەمانخاتە ئەو گومانەوە بڵێین: پەرستنی تەمووز ـ ئەدۆنیس، لە بنەڕەتدا هی رەگەزێك بوون، خوێن و زمانیان لە خەڵکیتر جیاواز بووە. ئەم رەگەزەش (سۆمەری)یەکانن، کە لە بەرەبەیانی مێژووەوە لەسەرووی کەنداوی عەرەب و ناوچەی عێراقی ئێستادا ژیاون و ناویان (بابل) بووە. ئەم بابل ـ یانە لە سەردەمی ژیانیاندا گەیشتوونەتە

پۆپەی شارستانێتی و گەشەکردن. هەر ئەمان بوون بۆ یەکەمجار زەویان کێڵاوە، مەڕ و ماڵاتیان بەخێوکردووە.. لەپاڵ ئەمانەشدا وەك پێویستی رۆژانە و جێگیربوونیان، گوند و شارۆچکە و خانووبەرەیەیان دروستکردووە، جۆگەیان بۆ خۆیان هەڵبەستووە. واشدەرئەکەوێ خواوەندی تەمووز، کۆنترین خواوەندی پەرستراویان بێت. ناوی تەمووز، بە زمانی (سۆمەری) بە مانای (کوڕی راستەقینەی ئاوە قووڵەکان) دێت، لە هەندێ لەو پارچە گڵێن و پاشماوە عەنتیکانەی بۆ سەردەمی ئەم بابلیانە دەگەڕێتەوە، گەلێ شیعری ستایشی (تەموون)یش دۆزراوەتەوە، کە مێژوویان زۆر پێش لە دایك بوونی (مەسیح)ە.

خواوەندی (تەمووز) لە ئەدەبی ئایینی بابلدا، نموونەی لاوێکی قۆزەو دڵداری کچە خواوەندی (عشتار)ە. عەشتاریش ژنی تەمووز و دایکە گەورەی هەموو پەرەسەندن و زاوزێکردنی سرووشتە. بەپێی ئەو بەڵگە مێژووییانەی دەیگێڕنەوە: خواوەندی تەمووز هەموو ساڵێك لە ناوەڕاستی هاویندا دەمرێ، یان ون دەبێ. مردن و ون بوونەکەیشی سەرهەڵگرتنە لە جیهانی خۆشییەوە، بۆ جیهانی ناخۆشی و تاریکی ژێر زەوی. کە ئەم مرد، یان ون بوو، کچە خواوەند، یان ژنە خواوەندی (عشتار)یش کە دڵدارێتی، بۆ ئەو سەرهەڵگرتن و گوم بوونە تاریکەوە، ئیتر هەموو خۆشییەکی سەر زەوی لە بزووتن دەکەوێ، هیچ شتێك زاوزێ ناکات، هیچ کەسێك خۆشیی ناچێژێ، کەسیش ئیتر دڵداری ناکات.. روونتر دەڵێین: جیهان، تاریك دادێت، نەهاتیی رووی تێدەکات، مەترسیی لەناوچوونی مرۆڤ و سرووشت دەکرێ... بۆ جلەوگرتنەوەی ئەم نغرۆبوون و سەرنگوونی و نەهامەتییە چاوەڕوان کراوەش، خواوەندی (ئەیا)ی گەورە، رابەرێك دەنێرێت، تا تەمووزی خواوەند رزگار بکات... بەڵام لەم کاتەدا (ئالاتۆ)ی خواوەندی دۆزەخ، قایل نابێ و دەڵێ ئەگەر (عەشتار) خۆی بە ئاوی ژیان نەشوات، رزگاریان ناکەم. ئەوسا عەشتار بەگوێی دەکات و سەر لەنوێ ژیانەوەی زەوی دەستپێدەکاتەوە... لەو کاتەشدا کە عەشتار سەرهەڵدەگرێ و دەکەوێتە گەڕان و پشکنین بەدوای تەمووزدا، هەموو خەڵکی، بە ئافرەت و منداڵ و پیاوەوە، بەگریان و خۆڕنین و موزیك و تەپڵ و دەف لێدانەوە، شوێنی دەکەون، لەکاتی شوێنکەوتنیدا، هەموویان وێرد دەخوێنن و نوێژی تایبەتی بۆ پەیکەری خواوەندە مردووەکە دەکەن،

له رۆژانی ئەم شیوەن و جەژنی ژیانەوانەدا، پەیکەرەکە بە ئاوی پاك دەشۆن و بەرگێکی سووری لەبەر دەکەن، داری عوود و بخووریشی بەسەرا دەسووتێنن، تا بۆن و بەرامەی ئەم بۆنانە، بە ئاگای بهێننەوەو، بێتەوە دنیای سەرزەوی.

له ئەدەبی نووسراوی (گریك)یشدا، تەمووزی خواوەند، لاوێکی شەنگ و شۆخە، (ئەفرۆدێت)ی کچە خواوەند، حەزی لێکردووە، بەڵام لەبەرئەوەی هێشتا تەمووز هەرزەکار و منداڵە، خواوەند لە سنووقێکدا دایناوەو داویەتیە دەست (برسیڤۆنی)ی ژنە خواوەندی جیهانی ژێر زەوی، بەڵام کاتێ (برسیڤۆنی) بۆ ئەوەی تەمووز هەر هی خۆی بێت، لەگەڵ خۆیدا دەیباتەوە بۆ جیهانی ژێر زەوی، لەم لاشەوە ئەفرۆیت شەڕی لەسەر دەکات.. تا لەم بەینەدا خواوەندی (زڤس) دێت بۆ ناوبژییان و وایان رێکدەخات بۆ ئەوەی هیچیان لە (تەمووز ـ ئەدۆنیس)بێ بەش نەبن، بڕیار دەدات تا شەش مانگ لەژێر زەویدا بێت و شەش مانگیش لەسەر زەوی.. ئەمە وادەمێنێتەوە تا لە هاتوچۆیەکی تەمووزدا، بەرازێکی دڕندەی کێوی دەیکوژێ.. دەشڵێن ئەم بەرازە (ئاریس)ی خواوەندی شەڕ و شۆڕ بووە. ئەویش هەر حەزی لە (ئەفرۆدێت) کردووە، بۆیە لە داخاندا کوشتوویەتی، ئەفرۆدێتی دڵداری، گریان و شیوەنێکی زۆر بەناوبانگ و خەمناکی بۆ کردووە.

بەڵگە بۆ ئەم بەسەرهاتە ئەفسانەییە، پارچە کاشییەکی کۆنە کە لە (گریك) دۆزراوەتەوە. مێژووی هەڵکۆڵینی دەگەڕێتەوە بۆ پێش زایین، تیایدا وێنەی (ئەفرۆدێت و برسڤۆنی) جووتە دڵداری (ئەدۆنیس) و لە هەمانکاتیشدا جووتە دوژمنی یەکتر، بەرامبەر بە یەك وەستاون، (زڤس)ی خواوەندیش، لە ناوەڕاستیاندا لەسەر کورسییەك دانیشتووە، پەنجەی گلەیی لێ بەرزکردوونەتەوەو بە رقەوە سەیری (برسیڤۆنی) دەکات، بەڵام ئەفرۆدێت سیمای خەمباری و ماتەمینی پێوە دیارەو تارایەکی تەنکیشی بەسەرە خەمبارەکەیدا داوە، برسیڤۆنیش چڵەدارێکی بەدەستێکی گرتووە بەدەستییەوەو بەدەستەکەی تری، پەنجەی بۆ ئەو سنووقە راکێشاوە کە (ئەدۆنیس ـ تەمووز)ی تێدایە.

### ١. ئەدۆنیس لە سووریا:

ئەدۆنیس لە دوو شاری رۆژهەڵاتی ئاسیادا باوبووەو زۆر بەرێزەوە ئاهەنگیان بۆ گێڕاوە. ئەم دوو شارە (بیبیلۆس) و (بافوس)ن، کە یەکەمیان لەسەر رۆخی سووریایە و دووەمیان لە (قوبرس)ە. هەر ئەم دوو شارە مەڵبەندێکی گرنگی پەرستنی (ئەفرۆدێت) بوون، کە بەرامبەر بە (عەشتار)ی بابلییەکانە، ئەم دوو شارە، باوکی ئەدۆنیس، کە ناوی (کینیراس) بووە، پاشا بووە، بەڵام شاری (بیبیلۆس) لە رووی مێژوویی و پیرۆزییشەوە لە بافۆس کۆنترە. وادەردەکەوێ ئەم دوو شارە چەند پاشایەك بەرەودوا فەرمانڕەواییان تێداکردووە، شێوەی فەرمانڕەواییەکە ئەنجوومەنی پیران یارمەتیداوە. ئەو تەنیا پاشایەش کە بەڵگەی مێژووییمان لەسەری هەیە، (زیکا)ی ناوەو نزیکەی سەدەیەك پێش (سلێمان) ژیاوە.. پاشای (جبیل)یش هەموو یەك لە دوای یەك نازناوی خۆیان ناوە ئەدۆنیس، کە مەبەست لە خاوەن و خواوەندی شارە. واش دەردەکەوێ کە پاشای (ئۆرشەلیم)ی کەنعانیی کۆن، ئەوانیش لە جێگاکانی خۆیاندا هەروەك ئەدۆنیس بوون. لەبەرئەوە ژنەکانی ئەم پاشایانە لە ئۆرشەلیمدا، هەروەك ژنەکانی تەمووز، شینیان لەسەر کردووە.

هەر لە سنووری ئۆرشەلیمدا کۆمەڵێك پیاوی تر هەبوون، پێیان وتراوە: پیاوانی پیرۆز. ئەمانە تا سەردەمی دەوڵەتی جوولەکەش هەر مابوون... لەوانەیە ئەمانیش هەروەك ئەدۆنیس هەمان دەوریان دیبێ، بەڵام ئەگەر ئۆرشەلیم لە دێرزەمانەوە مەڵبەندی زنجیرە سەرکردەی رۆحانیی بێ، ئەمانە کلیلی بەهەشتیان پێ بێ و لە سەرتاسەری وڵاتدا وەك پاشا و خواوەند رێزیان گیرابێ.. لێرەوە دەتوانین ئەوە بزانین کە بۆچی (داود)، ئەم شارەی کردە پایتەختی ئەو وڵاتە تازەیەی خۆی، کە بەزۆری شمشێر داگیری کردبوو... دەشێ گوێزانەوەی پایتەختەکەی لە شاری (خلیل)ەوە بۆ ئۆرشەلیم، لەبەرئەوە نەبووبێ کە ئەمیان قەڵای سەخت و بەرزی تیدابێ، بەڵکو لەبەرئەوەبوو کە ناوبانگ و مەزنیی و

پیرۆزیی پیاوە پیرۆزەکانی ئەوان بە بەرخۆیدا بکات و هەمان زێڕ و خشڵ و تاجی ئەوان لەخۆی بدات. چونکە پیرۆزیی و ناوبانگ و رێزی خواوەندەکانی ئەوان، ئەوەی خستبوونە دڵەوە کە لەکاتی گەمارۆدانی شارەکەیاندا، بێجگە لە متمانە و پشتبەستن بە دیوارە بەرزەکانی شارەکەیان، پشتیان بە گەورەیی خواوەندەکانیشیان ئەوەندە بەهێز بوو، کە دڵنیایان بکات و لە داگیرکردن بیانپارێزێ.. هەر ئەمەش بووە لەکاتی هێرشی سوپای ئاشوور و رۆمانەکاندا، جوولەکەکان ئەگەر بەرگری زۆریان کردبێ، هی ئەوە بووە کە بڕوایان بە خواوەندی (سەهیۆن) هەبووە. لەمەوە ئەو بەڵگەیەمان چنگ دەکەوێ، کە پاشاکانی (عیبرانی) لە دێرزەمانەوە دەوری ئەدۆنیسیان بینیوە، چونکە پاشای عیبرانی پێیوتراوە: (ئادونی ها میلیخ) واتە: گەورەم، یان: پاشای خواوەندم... لەکاتی مردنیشیدا کە شیوەنیان لەسەر تەرمەکەی کردووە، وتوویانە: (خوا رۆیە). گومانیشی تێدا نییە ئەم شێوەی لاوانەوە و شیوەنی پاشاکانی جوولەکە، هەمان شیوەن و لاوانەوەی ژنەکانی ئۆرشەلیمە، کە بەسەر مەرگی تەموزدا کردوویانە. هەر لەبەر ئەمە بوو کە پاشا، نازناوی (مەسیح)ی هەبووە.. واش دەردەکەوێ پاشاکانی عیبری، وەك هەموو پاشایانی خواوەند، خۆیان بە بەرپرسیار کردووە بەرامبەر بە برسێتی و رشانەوەو نەخۆشی.. بۆیە کە قات و قڕی و بێ بارانی بۆ ماوەی سێ ساڵ وڵاتی گرتەوە، لە (داود)یان پرسی: هۆی چییە؟! لە وەڵامدا وتی کە (شائوول)ی پاشای پێش ئەم، هۆی ئەم قات و قڕییەیە.. بەڵام شائوول بەو هۆیەوە کە مردووە، دەستی سزای ناگاتێ. لەبەرئەوە (داود) بە شوێن وەچەکانیدا گەڕاو (٧) حەوتیانی لە وەرزی دروێنەی ـ جۆ ـ دا بە بەرچاوی خواوەندەکەیانەوە بە پەتا کرد.. دایکی دووانیشیان، تا پاییزی ئەو ساڵە، لەژێر تەرمەکانیاندا مایەوە.. بۆ ئەوەی چەقەڵ و دڕندە لە پاییزدا تەرمەکانیان نەخوات، کە باران باری و ئاوی باران، تەرمەکانی تەڕکرد، باران زەوی ژیاندەوە، تەرمەکانیان داگیراو لە گۆڕستانی باپیرانیاندا ناشتیانن. بێگومان ئەم کارە لە ناوەڕۆکدا هەر مەسەلە (سزادان) نییە، بەڵکو وەك (قوربانی)یەکیش بووە بۆ باران بارین، چونکە لەکاتی هەڵواسینی تەرمەکانیاندا،

کۆمەڵێك دەستوور و نەریت و نوێژ و جادوویان بە مەبەستی باران بارین لەسەرکراوە.. واشدەردەکەوێ خەڵکی (ئیسرائیل)ییەکان بڕوایان وابووە، کەم و زۆری باران، پێوەندی بە تووڕەبوون و گرژبوونی خواوەندەوە هەیە، بۆیە کە پایتەختەکەیان لە (سبی)یەوە بۆ (ئورشەلیم) گوێزایەوە، لەبەردەم گۆڕەپانی پەیکەرە رووخامەکەیاندا کۆبوونەوە و بڕیاریاندا ئەگەر باران باری، هەموویان (وەك خۆ سزادان) لەبەریدا بوەستن.. باران باری و لەبەر شەست و رەهێڵەیدا هەڵ لەرزین، تا خواوەند لە تاوانەکانیان خۆش بێت و بیانبەخشێت..

بەڵام ئەگەر پاشاکانی (سامی) و پاشاکانی (بیبلۆس)، نازناوی ئەدۆنیس ـ یان لە خۆیان بنایە، دەبووایە لەگەڵ (عەشتار)ی ژنە خواوەندی وڵاتەکەدا، دەستیان تێکەڵکردایە، ئەمەش کە ئێمە وەك بەڵگە لە مێژووەوە بۆمان ماوەتەوە، ئەوەیە کە لە شارەکانی (صور و صیدا)دا، پاشا هەبوون، هەمان رەفتاریان کردووە ـ هەر لە نەریتی (سامی)یەکان، جووتیارەکانیشیان بڕوایان وابووە کە (خواوەند)، پیت و فەڕ و بەرەکەتی زەوی لە دەسەڵاتدایە، هەر ئەویش هێزی بەرهەمهێنانی گەنم و ترێ، هەنجیر و...هتد هەیە. بۆیە لە زۆربەی خاکی سامیدا، جیا لە باران، کانی و جۆگە و رووبار هەیە.. سەرەڕای ئەمەش هەر خواوەندەکانیان دەتوانن رووەك ببووژێننەوەو زاوزێ بە ئاژەڵ و مار و مێروو، تەنانەت بە مرۆڤیش بکەن... چونکە هەموو ئەم شتانە، لە دواییدا پێوەندییان بە بەرەکەت و پیتی زەوییەوە هەیە، هەر لەبەرئەوەش کە نەیانتوانیوە بەشەکانی ژیان جیا بکەنەوە، بۆیە هەر وایانزانیوە کە ئاژەڵیش، وەك رووەك، لە خاك دەرێت و رەگ و ریشەیشی هەر لە خاکدایە.. کەواتە لای ئەمان (زەوی) دایکی هەموو شتەکانە و ژیانی مرۆڤیش وەك ژیانی درەخت وایە..

ئەم دیاردەیە لە زۆربەی شیعرگەلی سامیدا و لەگەلێ نەتەوەی کۆنیندا باوبووە.. لە شیعرەکانیاندا رێز و نەوازشیان بۆ خواوەندەکانیان هەبووە بەرامبەر بەو بەرهەمە زۆرەی دەیانداتێ.. بێجگە لە ئەم شیعرانەش منداڵە نۆبەرەکانیان لە پەرستگاکاندا کردووە بە قوربانیی و ناویشیان وەك (خوا بەخش) و شتی وا ناو ناوە. نۆبەرەی میوەشیان هەر لە پەرستگاکاندا بەخشیوەتەوەو هەرچییەکیان

کردبێ، لە ئەنجامدا هەر مەبەست لە چاکەدانەوەی خواوەندەکانیان بووە.. خواوەندیش بە هەموو مانای وشەوە، مانای زاوزێ کردن بووەو مێردی زەوی بووە، کە ئەرکی ئەم زاوزێیەی لە ئەستۆ گرتووە. کەواتە خواوەندی سامی، مانای هێز و مەزنایەتی و زاوزێی هەموو زەوی و هەموو شتەکان بووە، کە ئەم زاوزێیەش لە نێر و لە مێ پێکدێت، بەشێوەیەکی گشتیش هێزی نێرەکەیان بە (ئاو) داناوە و مێینیەکەش بە (زەوی)... بەپێی ئەم بیرە، رووەك و ئاژەڵ و مرۆڤ، نەوەی ئەم دوو خواوەندە نێر و مێیەن.. لەبەرئەوە ئەگەر رێگا بە پاشایەکی سامی درابێ تا ببێتە خواوەند و ژنە خواوەند مارە بکات، یان داوای لێکرابێ، ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆ، مەبەست تەنیا مسۆگەرکردنی زاوزێ و پیت و فەڕی زەوی بووە..

## ٢ . ئەدۆنیس لە قوبرس:

بەپێی هەندێ پارەو دراوی کۆن، کە لە قوبرس دۆزراونەتەوە، وادەگەیەنێ کە جاروبار (فینیقی)ییەکان دەستیان بەسەر ئەم خاکەدا گرتبێ و لە ماوەی دەسەڵاتیشیاندا. خواوەندەکەی خۆیان، لەگەڵ خۆیاندا بۆ ئەم جێیە هێنابێ.. لەوانەشە ئەم خواوەندەی ئەمانیش هەر ئەو (ئەدۆنیس)ە بووبێ، کە لە سووربا باو بووە. چونکە لە نزیك شاری (ئەمائۆس) دەستوور و نەریتی پەرستنی ئەدۆنیس دۆزراوەتەوە، شێوەی پەرستنەکەشی، هەروەك پەرستن کارییەکەی شاری (بیبیلۆس) و پەرستنی (ئۆزیرس)ی میسریی دەچێ، بەجۆرێك کە بووترێ: پەرستنی ئەدۆنیس، لە (ئەماسۆس)، وەك (ئۆزیرس) وایە، بەڵام بەزۆری پەرستنی ئەدۆنیس و ئەفرۆدێت، لە قوبرسدا لە شاری ((بافوس)) و دەوروبەری بووە.. گومانیشی تێدانییە کە بافوس، تا کۆتایی سەدەی چوارەمی پێش زایین، پێشکەوتووترین ناوچەی ئەم دوورگەیە بووە، کە لە سەرەتای دروست بوونیدا، لەسەر لووتکەی گردێکی بەرز دروستکراوە و نزیکەی (١) میل لە زەریاوە دوو بووەو پەیکەری ئەفرۆدێتیش، کە لە بافوس دایە، زۆر زۆر کۆنە و ئێستا ئەم جێگایە پێیدەوترێ (کوکلیا). بەپێی هەندێ بەڵگەی مێژوویش وادەردەکەوێ کە ئەم پەیکەرە لەلایەن فینیقییە داگیرکەرەکانەوە دروست کرابێ.. رەنگە پێش

داگیرکردنی قوبرس، خەڵکی قوبرس، خۆیشیان خواوەندی تایبەتی خۆیان هەبووبێ، بەڵام دوای هاتنی ئەوان، نزیکایەتییەکی زۆر بەتین لە نێوان خواوەندی ئەمان و خواوەندی فینیقییەکاندا بووبێ و لە ئەنجامی ئەم نزیکایەتییەدا بە هەردووکیان، یەك خواوەندیان دروستکردووە، کە ناوی (دایکێتی و فەڕ و پێت)یان لێناوە..

ئەمجۆرە خواوەندانەش لە تێکڕای رۆژئاوای ئاسیادا، لە دێر زەمانەوە باو بوون و هەبوون و پەرستراون، شێوەی پەرستنیشیان وابووە کە خەڵکی قوبرس، لە ئاهەنگە شکۆدارەکانیاندا داوایان لە خواوەند کردووە کە (نەزۆکیی) لەسەر ژنانی قوبرس هەڵگرێ و (پیاوەتیی) و هێز و گوڕیش بە پیاوەکانیان بدات..

ئەوەش کە مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە، ئافرەتیان، لە کۆندا وا لەسەریان پێویستکراوە، پێش شووکردنیان، لەناو پەرستگای خواوەندا، لەگەڵ رێبواری نامۆدا دەست تێکەڵ بکەن.. ئەم نەرێتەش لە گەلێ ناوچەی ئاسیادا باو بووە، ئیتر گرنگ نەبووە ئەم خواوەندە ناوی چی بووبێ.. بۆ وێنە لە (بابل)دا هەموو ئافرەتێك، هەژار بووبێ یا دەوڵەمەند، دەبووایە لە ژیانیدا یەکجار، لە پەرستگای (میلیکا ـ واتە عەشتار)دا، دەست لەگەڵ پیاوێکی نامۆدا تێکەڵ بکات و ئەو بڕە پارەیەش کە لە بەرامبەر ئەم دەست تێکەڵکردنە پیرۆزەدا وەردەگیرا، دەبووایە پێشکەش بە خواوەند بکرێ.. لەبەرئەمە زۆرجار وابووە، بۆ بەجێگەیاندنی ئەم کارە، هۆڵ و دالانی پەرستگاکە، پڕ دەبوون لە ژنان و چاوەڕوانی رێبواری نامۆیان دەکرد...

تەنانەت بەپێی یاسای (ئاموری)یەکان، دەبووایە هەموو کچێك پێش ئەوەی شوو بکات، هەفتەیەك لەبەر دەرگای پەرستگادا ئەم کارە بکات و پارەکەشی پێشکەش بە خواوەند بکا.. هەندێ جاریش ئەم چاوەڕوانییە رۆژان و مانگان و سالانی خایاندووە، واتە ئەو ئافرەتانەی ویستوویانە زیاتر خزمەتی خواوەند و پەرستگاکەی بکەن، زیاتر لە پەرستگادا ماونەتەوەو ئەم کارەیان کردووە..

بەڵام لە (بەعلەبەك)ی لونباندا (قوستەنتین)ی ئیمپراتۆر، ئەم نەرێتەی نەهێشت و پەیکەرەکەی شکاند و لەجێی ئەو، کەنیسەیەکی تری دامەزراند.

له (بیبیلۆس)دا هەموو ساڵێك، له رۆژانی ئاهەنگ گێڕاندا بەسەر (ئەدۆنیس)دا، پیاوان سەریان دەتاشی و ژنانیش قژیان دەبڕی.. هەر ژنێکیش قایل نەبووایە قژی ببڕێ، لەجیاتی ئەمە دەبووایە (رۆژێك)، خۆی تەرخان بکات بۆ ئەوەی له پەرستگا، لەگەڵ پیاوانی نامۆ دەست تێکەڵ بکات. هەموو ژنانی وڵاتیش، بەبێ جیاوازی، ملکەچ بوون بۆ بە ئەنجامگەیاندنی ئەم نەریتە ئایینییە.. ، گرتنە ئەستۆی ئەم کارە، بە واتا بەجێهێنانی ئەرکێکی ئایین.. کەواتە قژ بڕین نیشانەی ئەوەبووە کە هێشتا خاوەنەکەی (کچ)ە، هەر کچێکیش بە یەکێ لەم دووانە (قژبڕین یان دەست تێکەڵکردن لەگەڵ پیاوی نامۆدا) قایل نەبووایە و سەرپێچی بکردایە، وەك شتێکی لەکەدار و خەوش، لەسەر بەردێکی مەڕمەڕ باسی سەرپێچییەکەی دەنووسراو ناوی تۆمار دەکرا، کە فلأنە کچ، لە فیسارە خێزان، سەرپێچی بەرامبەر بە ئایین کردووە.

له (ئەرمینیا)ش بە شەرەفترین خێزان، ئەوانە بوون کە کچەکانیان بۆ راژەی خزمەت و (ئەنانیس)ی خواوەند تەرخان دەکرد و دەبووایە کچەکانیان، پێش شووکردن بۆ ماوەیەکی درێژ، ئەم کارە بکەن. دوای ئەنجامدانی ئەم کارەش، هیچ پیاوێ دوو دڵ نەبووە لەوەی یەکسەر مارەیان بکات و بیانخوازێت، چونکە کارەکە، بەکارێکی پیرۆز زانراوە.

ئەمە ئەگەر بەو چاوە لێکبدرێتەوە کە مەبەست لە ناوەڕۆکی ژن و مێردایەتی بەلای ئایینییەوە چۆنە. دیارە مەبەست لە ژن و مێردایەتی، شتێکی پیرۆز بووە، بە ئەنجامگەیاندنیشی بە ئەرکێکی پێویست و مەزن زانراوە، بۆیە هەر لەم رووەوە دەڵێن ئەو ئافرەتانەی پێش شووکردنیان بە پیر ئەم فەرمانەوە چوون، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە ئەرکە ئایینییەکە، بە چاکی بە ئەنجام دەگەیەنن، ئەم کارە (سێکس)ەیان لەناو پەرستگادا کردووە، تا خواوەند خۆی چاوی لێبێ و ئاگای لێبێ کە پەردەی کچێنیی ئافرەتەکە لەناو پەرستگاکەی ئەودا لادەبرێ (کە گەورەترین شکۆ و سەرمایە و شانازی ئافرەتەکەیە)، لە هەمان کاتیشدا گەورەترین (قوربانی) دانە بۆ خواوەند.

تێکڕای ئەم بەڵگانە، ئەوەمان پیشان دەدەن کە لای هەموو نەتەوەکانی ڕۆژئاوای ئاسیادا، خواوەندێکی گەورە پەرستراوە، ڕەمزی (دایکێتی و فەڕ) بووەو نموونەی زاوزێی هەموو شتێکی سرووشت بووە. ئەم ڕەمزە، بەپێی جێگاکان ناوی هەمەجۆری هەبووە، بەڵام زۆربەی شێوەکانی پەرستن و نەریتی قوربانی و نەزر، بۆ ئەم خواوەندانە لە یەکەوە نزیکن..

ژنە خواوەندەکانی سەر بەم ئەفسانە و نەریتانە، هەمیشە (دڵدار)، یان کۆمەڵێك دڵداریان هەبووە. ئەم دڵدارانەش پلەی خواوەندییان هەبووە، بەڵام هەموو سەری ساڵێك مردوون.. ئەم دڵدار و دڵدارانە، دەبووایە ساڵانە کاری (سێکس)ی لەگەڵدا بکەن، بە مەبەستی زاوزێ و پیت و بەرەکەتی زەوی و ئاژەڵ و پیت و بەرەکەتی گژوگیاو هەرچی لەسەر ڕووی زەوی هەیە... ئەم (سێکس)ە ئەفسانا‌وییە، بووە بە باو و ژن و پیاو دەبووایە لەبەر پێی خواوەندا دەست تێکەڵ بکەن. ئەمە ئەگەر پاشماوەی ئەو سەردەمە بێ، کە ژن هێنان، باو نەبوو بێ، چونکە ژن هێنانیان بە دابڕان لە کۆمەڵگا داوەتە قەڵەم..

کەواتە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە خواوەندی ژن، وەك یاسای ژن و مێردایەتی، پابەند نەبووە بە مێردێکەوەو لە هەمانکاتیشدا (کچ) نەبووە، یان (کچێنیی) نەماوە.. لێرەدا ئەم پرسیارە سەرهەڵدەدات: بۆچی ئەم ژنە خواوەندە بە شێوەیەکی ڕەسمی، ژنی خواوەندێکی پیاو نەبووە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: چونکە ئەگەر شووی بە پیاوێك بکردایە، هەموو پیاوێك بۆی هەبوو لەخۆی مارە بکات، بەڵام کە ئەم نەریتەیان کرد بە دەستوور، بەوەی کچ پێش شووکردن لە پەرستگای خواوەندا دەست لەگەڵ پیاوی نامۆدا تێکەڵ بکات، تا چێژی ئەم کارە (سێکس)ییە هانیان بدات لە ڕێگای ژن و مێردایەتییەوە (بە ڕەسمی) ببن بە هاوسەر..

لە هەمانکاتیشدا هەر ئەم دەستوورە بوارێك بووە بۆ ئەوەی کوڕ و کچێك، لە ژیانی پێش (هاوسەرێتی)یاندا، سەربەستی ئەوەیان هەبێ بۆ یەکجار (سێکس) لەگەڵ خەڵکی نامۆدا بکەن...

بەڵام دوای چەند سەدەیەك، وردە وردە، کە دەسەڵاتی پیاو زیادی کرد، ئەم کارەی لەبەرچاو کەوت و کۆمەڵگاش قێزی لێکردەوە، تا وای لێهات لە بەرامبەر

بەجێگەیاندنی ئەم کارەدا، کچان قژیان ببڕن.. کە هەمدیسان مانای قوربانیدانە بۆ خواوەند... بەڵام دوای ئەمەش هەندێ کچ هەر پابەندبوون بە نەریتی کۆن و هیوایان هەبووە، کە نەك تەنیا هەریەکجار لە ژیانیدا (سێکس) بکات، بەڵکو لەبەر بەرژەوەندی وڵات و فەڕ و پیتی زەوی. تا چەندساڵێکیش لەبەر دەرگاو لەبارەگای پەرستگادا هەر ئەم کارەی دەکرد.

واشزانراوە کە (کینیراس ـ باوکی ئەدۆنیس)، کاتی خۆی، لەگەڵ کچەکەی خۆیدا دەستی تێکەڵ کردووە، واتە ئەدۆنیس لەو کچە بووە، کاتێ ئەم دەست تێکەڵکردنە، رێکەوتی وەرزی (درەو)ی کردووە، ئیتر دوای ئەم رووداوە، دانیشتووانی وڵات کە هەموو ساڵێك لەکاتی درەودا، ژنانی وڵات، جل و بەرگی سپیان لەبەر کردووە و وەك رەمزی بەروبوومی گەنمیش، چەپکە گوڵە گەنمیان بەدەستیانەوە گرتووە. ئەم ژنانە تا ماوەی (٩) نۆ رۆژیش ناچنە پاڵ مێردەکانیان...

رەنگە ئەم ئەفسانانە، لەسەر بناغەیەکی راستیی بن، چونکە لەو وڵاتانەدا کە نەریت وایە پاشاکانیان (ئافرەت بێ)، پیاو، لە رێگای هێنان و مارەکردنی ئەو ژنە پاشایانەوە، دەبێ بە سەردار و گەورە. لەبەرئەوەی ئەو ژنە پاشایە، میراتگری گەورەییە و ئەو (پاشا)ی راستەقینەیە... ئەم نەرێتە وایکردووە، زۆرجار سەردارێك، یا میرێك، ئەو خوشکەی خۆی بخوازێ، کە میراتگری پاشایەتی بووە، ئەگەر ئەم برایە ئەمەی نەکردایە، لەوانەبوو، پیاوێکی نامۆ لەجیاتی ئەم برایە، ئەو کچە میراتگرە بخوازێ و تاجی پاشایەتی لەسەر بنێ..

کاتێکیش ئەو سەردارە، یا ئەو میرە، هەر بۆ ئەوەی ئەو تاجە بە هەمیشەیی لای خۆی بێ، ئەگەر ژنەکەی، یان خوشکەکەی، بمردایە، یەکسەر کچەکەی خۆی دەخواست... واشبیستراوە کە ئەفرۆدێت، لەیەك کاتدا حەزی لە (کینیراس)ی باوکی ئەدۆنیس و لە ئەدۆنیسی کوڕیشی کردووە... ئەم چیرۆکی ئەوینانە، کە لەیەك کاتدا ئەفرۆدێت، حەز لە دوو کەسی خێزانی پاشایەتی بکات، شتێکی سەیر نەبووە.. دەڵێن (بگمالیون)ی فینقی، کە پاشای (قوبرس) بووە، نەك هەر حەزی لە ئەفرۆدێت کردووە، بەڵکو حەزی لە پەیکەرەکەشی کردووەو وا دەگێڕنەوە، کە شەوان، پەیکەرەکەی بردۆتە لای خۆی و لە باخەڵیدا خەواندوویەتی..

لێرەدا دەبێ ئەوەمان بێتەوە بەیاد، کە (بگمالیون) خەزووری ـ کینیراس ـ ەو ئەدۆنیسیش کوڕی کینیراسە، هەرسێکیشیان یەك لە دوای یەك حەزیان لە ئەفرۆدێت کردووە... ئەم بەڵگانە وامان پێدەڵێن کە پاشایانی فینیقی (بافوس) و نەوەکانیشیان، هەر نەك بە تەنیا زێوانی ئەفرۆدێتی خواوەند بوون، بەڵکو لە هەمانکاتیشدا حەزیان لێکردووە. کەواتە سەرومڕ هەموویان کەسێتی (ئەدۆنیس)یان نواندووە. ئەدۆنیسیش لە کاکڵەی مەبەستدا، پاشای قوبرس بووە، بە مانای (گەورە و مەزن و سەردار) هاتووە، ئەو چیرۆکەی (بگمالیۆن)یش کە وتمان حەزی لە پەیکەری ئەفرۆدێت کردووە، واباو بووە کە لە ئاهەنگێکی گەورەو پیرۆزدا، پەیکەری (ئەفرۆدێت، یان عەشتار) لە پاشا مارە بکەن.. ئەگەر ئەمە راست بێ، مانای ئەوەیە پاشاکانی دوای بگمالیۆنیش هەمان نەرێتیان دووبارە کردۆتەوە، ئەمەش لەسەر شوێنەواری هەندێ یادگاری دۆزراوەدا سەلماوە، کە ناوی (بگمالیۆن و عەشتاروت)، بە جووتە لەسەر نەخشێکی (قرطاجن)ی هەڵکۆڵراوە. نەخشەکە زێڕەو لە شێوەی مەدالیادایە و لە مەزارێکی (قرطاجن)ەدا دۆزراوەتەوە...

دیسان هەر کینیراس، کە دامەزرێنەری ئەم نەریت و باوەیە، هەر ئەویش بووە لە سەرەتادا ئەوەی کردووە بە باو، کە کچ، پێش شووکردنی، دەبێ لەبەر دەرگای پەرستگای ئەفرۆدێت ـ عەشتاردا، بۆ یەکجار دەست لەگەڵ پیاوێکی رێبوار و نامۆدا تێکەڵ بکات، کچەکانی خۆیشی پەیڕەوی ئەم نەرێتەیان کردووە. ئەم کینیراسە، کە هەر بەناوەکەشیدا دیارە، زۆر حەزی لە موزیك کردووە، ((کینرا)) بە یۆنانی کۆن بە مانای (گیتار). ئەم وشەیە لە وشەیەکی کۆنی (سامی) وەرگیراوە، کە (کنیور) واتە(گیتار)ە. هەر ئەو وشەیەشە، کە (داوود) پێغەمبەر لە بەردەم (شائوول)دا موزیکی پێ ژەندووە.

واشزانراوە کە ئامێری گیتار، هەروەك لە (ئۆرشەلیم)دا پەسەند بووە، هەر بەو جۆرەش لە (بافوس)دا پەسەندبووە. مەبەستیش لەم گیتار ژەندنە، هەر بۆ ئاهەنگ و خۆشیی و کات بەسەربردن نەبووە، بەڵکو وەك کارێکی ئایینی وابووەو مالوومەکانی (ئۆرشەلیم) بەدەم موزیك ژەندنەوە، پێشبینی و نوقڵانەی داهاتوویان لێداوە. بۆیە لە (تەورات)دا باسی کۆمەڵێك هاتووە، کە بەدەم

ڕۆیشتنەوە، موزیکیان ژەندووە و نوقلآنەیان لێداوە.. کاتێکیش کە هێزەکانی (یەهوداو ئەفرایم) یەکیان گرت و بە جووتە شوێن دوژمن کەوتبوون، دوای سێ ڕۆژ ڕۆیشتن و ماندووبوون، تینوێتی زۆری بۆ خۆیان و بۆ ولآخەکانیان هێنابوو، ئا لەم کاتەدا (یشاع)ی پێغەمبەر، کە لەگەڵ سوپاکەدا بوو، گۆرانی بێژێکی بانگ کردو داوای لێکرد موزیك بژەنێ... شنینەوەی شەپۆلی مۆسیقا، سەربازەکانی خستەوە جووڵە و لە جێی خۆیاندا (کە دۆڵێك بوو ئەمبەر ئەوبەری شاخ بوو) دەستیانکرد بە سەنگەر هەڵکەندن.. بۆ سبەینێ، بەیانی، سەیریان کرد سەنگەرەکان ئاویان تێزاوەو پڕ بوون لە ئاو، بەمە پێغەمبەرەکەیان کارێکی گەورەی بۆ بە ئەنجامگەیاندن، چونکە هەر لە ئاوێنەی ئەو ئاوەدا، کە وێنەی (ڕۆژ)یان تێدابینی، مەیلە و سوور دەبریسکایەوە، وایانزانی خوێناوی دوژمنەکانیانە، یان ڕەمزێکە بۆ خوێنی ڕژاوی خۆیان، ئیتر بەمە خرۆشان و روویان کردە سەر سەربازگەی دوژمن و بەهێرشبردن، شڕ و وڕیان کردن.

دیارە زەبری موزیك، لەسەر پێشخستنی ئایین، شتێکە پێویستی بە وردبوونەوە هەیە، ئەو سەرگورشتەیەش کە دەڵێ (ئۆپۆلۆ)ی خواوەندی موزیك و شیعر، هاوڕێی (کینیراس) بووە، دەشێ زۆر ڕاست بێ، چونکە هەردووکیان حەزیان لە موزیك کردووە، بەڵام لێرەدا بۆمان هەیە بپرسین کە ئاخۆ، کار و زەبری موزیك لەسەر ئایینی یۆنانی کۆن و سامی چییە؟! لە وەڵامدا دەڵێین ئەو پەند و چیرۆکانەی کە لە پێغەمبەران (یشاع و داوود)ی دەگێڕنەوە، گوایە گیتار، لای (یشاع) بۆ ئەوە ژەندراوە، تا جۆش و خرۆشی گیتارەکە، بیگەیەنێتە پۆپەی پێغەمبەرێتی. (داوود)یش گیتاری بۆ ئەوە ژەندەوە، تا دەستی پیس و جنۆکە، لە (شائوول) دوور بخاتەوە. بەڵام لای یۆنانی کۆن، مەبەست لە دامرکاندنەوەو هێمن کردنەوەی گیان و قووڵایی دەروون بووە.. ئەوەش لێرەدا پێوەندی بە چارەنووسی (کینیراس)ەوە هەیە، هەر موزیکە، چونکە هەندێ لەو بەسەرهاتە مێژووییانە وادەگێڕنەوە کە کینیراس، لە داخی ئەوە خۆی کوشتووە، گوایە گرەوێکی لەسەر بابەتی موزیك، لەگەڵ (ئۆپۆلۆ)دا کردووەو گرەوەکەی دۆڕاندووە.. هەندێکی تریش دەڵێن خۆکوشتنی کینیراس، هۆی دیکەی هەبووە، نەك موزیك.

## ٣. ژنان و پیاوانی پیرۆز له هیندستان:

پێشتر وتمان، له هەموو رۆژئاوای ئاسیادا ئەو نەریتە باوبووە کە هەموو ئافرەتێك، پێش ئەوەی شوو بکات، لەسەری پێویست کراوە بۆ یەکجار دەست لەگەڵ پیاوێکی نامۆدا تێکەڵ بکات، ئەم نەرێتە پێیوتراوە: (نەریتی پیرۆز) و له فینیقیا و قوبرسدا بۆ قوربانی و نەزری ئەوین، پێڕەو کراوە، بەڵام لە هەندێ جێگای تردا، ئەم نەریتە بەجۆری تر بووە. بۆ وێنە لە (هیندستان) لە پەرستگاکانی (تامیلی و دلڤاداسی)دا، هەندێ ئافرەتی سەماکەر هەبوون کە ئیشیان هەر ئەوە بووە رۆژی دووجار سەما لەبەردەم خواوەنددا بکەن و هەموو جارێکیش کە خواوەند ئاهەنگی بۆ دەگێڕدرێ، ئەم سەماکارانە بچنە سەرشان و دەستی پەیکەری خواوەند و (گمبارتی)یش کە رەمزی رووناکیی پیرۆزە، بگرن بەدەستەوەو سەما بکەن..

بۆ بەڵگەی ئەمە، هەندێ نەخشی دۆزراوەی (١٠٠٤) ساڵی دوای زایین، وایان تێدا نووسراوە، کە بۆ پەیکەری شا (راجاجارا) لە (تەنگور) ژمارەی (٤٠٠) چوار سەد ئافرەتی سەماکار، لە خانووەکانی دەوروپشتی پەرستگاکە هەبوون.. ئەمانە هەر لە منداڵییەوە فێری سەما کراون و تایبەت بوون بە پەرستگاوە، ئەم کارە لای هەندێ کەس ئەوەندە پیرۆز بووە، هەندێ ژنی سك پڕ، هەر بە سك پڕیی نەزریان دەکرد، کە ئەگەر منداڵەکەیان بە سەلامەتی لەدایك ببێت، بیکەن بە سەماکەری تایبەتی خواوەند...

لە شاری (تیرکانی گندرام) هەرچی ماڵە خەیاتێکە، کچە گەورەکەی بۆ راژەی خواوەند تەرخان دەکات، ئەم کچانەش بە شێوەیەکی رەسمیی، لە پەیکەرەکەی خواوەند، یان لەو شمشێرانەی لە پەرستگای خواوەند دان، مارە دەکرێن. واتە بەم شێوەیە دەبن بە ژنی خواوەند..

لەسەرتاسەری خوارووی هیندستانیشدا، چینی خەیاتە گەورەکان، هەر خێزانێکیان، کچێك بۆ خواوەند تەرخان دەکات، کە بەپێی دەستوور و نەریت،

ئاهەنگێکی گەورەو قەشەنگ ساز دەکەن، هەموو خزمانی ماڵی کچەکەش بۆ ئاهەنگەکە داوەت دەکرێن.. خاڵی کچەکە، قرتێلەیەك لەناو چاوانی کچەکەوە دەپێچێ و بە باوەش دەیبات لەسەر تەختەیەکی پان و گەورە، دایدەنێ، قەشەیەکی (براهمی)یش هەندێ وێرد و سۆزی ئایینی لەسەر دەکات، ئینجا ئاگرێك دەکەنەوە، کە زۆرلایان پیرۆزەو ناوی (حومام)ە. دوای ئەمە دایکی کچەکە پارچە قوماشێك بەدیاری بە خاڵی کچەکە دەدات، داوا لە قەشەکە دەکرێت دەست لەگەڵ کچەکە تێکەڵ بکات (لەبەرئەوەی ئەم قەشەیە لای خەڵك، پلەی لە دوای خواوەندە)، لەوکاتەشدا کە قەشەکە دەچێتە پاڵ کچەکە، دەڵێن شمشێرێك لە پاڵ کچەکەدا دادەنێ، ئەگەر بۆ چەند دەقیقەیەکیش بێت...

یان هەر لەناو ئەم پەرستگایانەدا، ئەگەر یەکێك لەو کچە سەماکارانە، خۆی کوشت، یان مرد، بە پارچەیەك لەو قوماشەی بەسەر پەیکەری خواوەندەوەیە، دادەپۆشرێ... هەر لە باخچەی پەرستگاکەش چەپکێ گوڵی بۆ دەچنرێ و بەسەریدا پەخشان دەکرێ.. دوای ئەوەی دەیشۆن و کفنی دەکەن، ئینجا نوێژی لەسەر دەکەن، چونکە پێش شتنی بە (بێ نوێژ)ی دەزانن..

بەڵام لە شاری (ماهراتا)، ئەو کچە تایبەتییانەی خواوەند، لای خەڵك زۆر جێگایان بەرزە و وادەزانن کە جاروبار سێبەری خواوەندی بەر دەکەوێ و دەچێتە پاڵی.. بۆیە بە پێشبینیزان و نوقڵانەزانی دەزانن و بۆ هەندێ ئیشوکار، راوێژی پێدەکەن و پارەی لەبەر پێدا هەڵدەڕێژن و هەر قسەیەکیش لە زاری بێتەدەرەوە، بە فەرمایشی ئاسمان و خواوەندی دەزانن.

لە شاری (تولاڤا)ش، کە کەوتۆتە خوارووی هیندەوە، مەرج نییە سەماکارە تایبەتییەکانی خواوەند، هەر (کچ) بن، دەشێ ژنیش بێ، ئەو ژنەی کە لە مێردەکەی وەڕسە، یان بێوەژن کەوتووە، نایەوێ شوو بکاتەوە، پەنا دەباتە بەر خواوەندو لەو برنجە دەخوات کە بەتایبەتی بۆ خواوەند دانراوە، ئیتر ئەگەر (براهمی) بێت، بۆی هەیە لە پەرستگادا، یان لە دەرەوەی، نیشتەجێ بێ، خۆراکی رۆژانەشی هەر لەو برنجە دەدرێتێ - . ئەرکی سەرشانیشی گسکدانی پەرستگاو باوەشینکردنی خواوەند دەبێ..

بەڵام لە شاری (تراڤنکور) نەریت وایە ئەو کچانەی بە سەماکاری خواوەند دادەنرێن، یان شووی پێدەکەن، ئاهەنگێکی وا ساز دەکرێ، نیشانەی ئەوە دەگەیەنێ، ئیتر شووی بە خواوەند کردووە و لێی مارە کراوە.. ئەم کچانە دەبێ تەمەنیان لە شەش، تا هەشت ساڵە تێپەڕ نەکات، مێردەکەشی ئەو قەشەیە دەبێ کە سەرپەرشتیاری پەرستگای ناوچەکەیە، ئاهەنگەکەش هەر لەماڵی ئەوداو لەسەر ئەرکی ئەو دەکرێ.. بۆ ئاهەنگەکەش پەرستگاکە بەشێوەیەکی شکۆدار دەڕازێننەوە.. کچەکەش پاش ئاهەنگەکە، گەرماو دەکات و دوو پارچە قوماش لەگەڵ خۆی دەهێنێ، قەشەکە دوو پارچە قوماشەکەی لێوەردەگرێ و لەبەر پێی خواوەندا رایدەخات.. کچەکە لەبەردەم خواوەندا وا دادەنیشێ، کە رووی لە خواوەند بێ، ئینجا قەشە، ئاگرە - پیرۆزەکە دەکاتەوەو خەڵکی دەست بە بەجێهێنای نەریتی پەرستن دەکەن.. یەکێك لە پارچە قوماشەکان لە کچەکەوە دەئاڵێنن و دوای سەما و نوێژی تایبەتی لەسەری، دەگەڕێتەوە ماڵی باوکی.. لەوێش تا چوار رۆژ ئاهەنگ و زەماوەند هەر بەردەوام دەبێ، لە هەموو ئەم ئاهەنگانەدا قەشە دەوری زاوا دەبینێ، ئیتر لە دوای ئەمە، ئەم کچە دەبێت بە ژنی خواوەند، واتە ژیانی تەرخان دەکات بۆ راژەی خواوەندو ئەوەندەی پێوەندی ژن و مێردایەتی، ئەم کچە دڵسۆزی ئەو خواوەندە دەبێ.. بەپێی دەستووری پەرستگاش، هەندێ جار کچەکە (رۆژوو) دەگرێ و رۆژووی ئەوان وایە، رۆژی یەك ژەم، نان دەخوات، رۆژانی ئەو رۆژووگرتنەش، کاری (سێکس) لەگەڵ قەشەدا ناکات.

## ٤ . ژنان و پیاوانی پیرۆز له ئه‌فه‌ریقا:

له ئه‌فه‌ریقا، کچ به دوو جۆر ده‌بن به ژنی خواوه‌ند، له گوێ ئاوی (ره‌قیق) ده‌ستوور وایه هه‌ر له منداڵییه‌وه، یان دوای ئه‌وه‌ی که گه‌وره ده‌بن.. ئیتر ئه‌مانه خۆیان به یه‌کجاریی بۆ خزمه‌تی په‌رستگا ته‌رخان ده‌که‌ن، که خۆیان ته‌رخان کرد، پێیان ده‌وترێ (فۆدۆسی) واته: ژنی خواوه‌ند، ئه‌مانه هه‌ر ئه‌رکیان (سێکس) ده‌بێ، که بۆ خزمه‌تی په‌رستگای سه‌رف ده‌که‌ن، له هه‌موو شارێکیشدا په‌یمانگه‌یه‌ك هه‌یه بۆ ئه‌وه‌ی کچانی (١٠ ـ ١٢) ساڵی تیدا وه‌ربگیرێ، بۆ ماوه‌ی (٣) ساڵ خه‌ریکی په‌روه‌رده کردن و فێرکردنیان ده‌بن بۆ ئه‌وه‌ی سه‌مای تایبه‌تی و ویرد خوێندن و ره‌وشت و خووی ناو په‌رستگا فێربن..

ئه‌مانه له په‌یمانگه‌که‌دا له‌گه‌ڵ مامۆستاو قوتابییه کوڕه‌کانی په‌رستگادا فێری هونه‌ری (سێکس) ده‌کرێن و دوای ته‌واو کردنی سێ ساڵه‌که، ئیتر خه‌ڵکیتریش بۆی هه‌یه ده‌ستیان له‌گه‌ڵ تێکه‌ڵ بکات. که‌سیش ئه‌مه به‌شێکی نه‌نگیی و خه‌وش نازانێ، چونکه به شاژنی خواوه‌ند داده‌نرێن و نابێ (شوو)ش بکه‌ن، منداڵیشیان ببێ، هه‌ر به موڵکی خواوه‌ندی ده‌زانن..

دیسان هه‌ر له‌م ناوچه‌یه‌ی ئه‌فه‌ریقادا، یاسایه‌کی تایبه‌تی هه‌یه بۆ ژنانی (داینه‌غبی) به واتا: (خواوه‌ندی مار) و قه‌شه، ئه‌و ئافره‌تانه‌ی له په‌رستگاکه‌یدا کاری سێکس ده‌که‌ن، له جێگایه‌کی په‌رژین داری تایبه‌تیدا په‌روه‌رده ده‌کرێن، زۆربه‌ی ئه‌ندامانی ئه‌م ده‌ستانه، کچی هه‌رزه‌کارن، به‌ڵام هه‌موو ئافره‌تێکیش ژن بێ، یان کچ، سه‌ربه‌ست بێ یان کۆیله، بۆی هه‌یه له‌گه‌ڵ ئه‌م هه‌رزه‌کارانه ناونووس بکات و له گه‌ڵیاندا بمێنێته‌وه، به‌مه‌رجێك له‌به‌ر چاوی خه‌ڵك واخۆی نیشان بدات، که رۆحی خواوه‌ندی تیدا ته‌واوه‌ته‌وه‌و جاروباریش سۆز و قریشکه و زریکه‌ی لێ به‌رزببێته‌وه. ئه‌و ئافره‌تانه‌ش که دێنه ناو ئه‌م کۆمه‌ڵ و ده‌ستانه‌وه، که‌س بۆی نییه، ده‌ستدرێژییان بۆ بکات. ئه‌وانیش بۆیان نییه له ماوه‌ی ئه‌م سێ ساڵه‌دا، سه‌ر له ماڵی مێردیان بده‌ن (ئه‌گه‌ر ژن بن)، یان سه‌ر له ماڵی باوکیان بده‌ن (ئه‌گه‌ر کچ بن). ئه‌گه‌رچی ئه‌مه واده‌کات زۆرجار ئه‌م ژنانه،

گزی له مێردەکانیان بکەن، بەڵام له هەمانکاتیشدا دەروویەك له ژنه کۆیلەو چەوساوەکان دەکاتەوە. که ئاهێك بدەن و سەربەستیی وەربگرن، چونکه هەموو ئەو رەفتارانەی ئەم ژنانه لەم کاتانەدا دەینوێنن، وا دادەنرێت که له خۆیدا نییه و وەحی خواوەندی بۆ دێت، تەنانەت مەسەلەی (سێکس)یش، هەر به دەرەوەی دەسەڵاتی خۆیان دەزانرێ، بۆیه رێگایان لێناگیرێ و سەربەستن لەگەڵ هەر کەسێکا، دەست تێکەڵاو بکەن.. ئەمه له هەمانکاتدا چاولێکردنی ژنه خواوەندە، که (شاژنی پاشای وڵات دەگرێتەوە)، بۆ ئەوەی فەڕو پیتی زەوی، بەهێز و پتر بێ.. ئەمانه له وەرزی چرۆکردنی (گەنمه شامی)دا، بەپێی نەریت و دەستووری تایبەتی، لەناو پەرستگادا، شوو به خواوەند دەکەن.. که له ناوەڕۆکدا. مەبەست له بەیەکەوە بەستنی ژنهێنانی خواوەند و شووکردنی ئەم ئافرەتانه و چرۆکردنی گەنمی شامیدا، سەرهەڵدانی فەڕ و پیتی زەوییە.. بۆیه لەم وەرزەدا ژنه (سەرە)کانی پەرستگا، گۆچان بەدەستیانەوە دەگرن و به زریکه و قریشکه و هاوار، به شەقام و کۆڵانەکاندا رادەکەن و پەلاماری ئەو کچه هەرزەکارانه دەدەن، که له رێگه و بان تووشیان دەبن و دەیانفڕێنن، بەو نیازەی بیانکەن به ژنی خواوەند..

هەندێ خێزانیش، هەر به خواستی خۆی و به نیازی قوربانی و نەزرکردن، کچەکانیان لەبەر دەرگایماڵەکانیاندا رادەگرن، بۆ ئەوەی بۆ پەرستگا بفڕێنرێن، تا له ئەنجامی شووکردنی ئەم کچه هەرزەکارانەدا بەخواوەند، فەڕوپیتی زەوی زیاتر بێ و ئاژەڵ و باڵنده پەره بسێنێ...

ئەو کوڕانەش که دەیانەوێ تایبەت بن به خواوەند، وەك ئەم کچانه ماوەی (٣) ساڵ، له هەمان دەورەوپەیمانگادا، پەروەردە دەکرێن، دوای سێ ساڵەکە، چەند قەشەیەك (وەك تکاکار) لەگەڵە خۆیان بۆ پەرستگا دەبەن، لەوێ له جێگایەك بەرامبەر پەیکەری خواوەند دادەنیشێنرێ.. قەشەیەك، به دەرمانێکی گیراوە، ناوچاوانی تەڕدەکات.. ئینجا هەموو پێکەوە بەیەك دەنگ. دەست به پاڕانەوەو لالاندنەوەی خواوەند دەکەن.. لەو کاتەدا ئەگەر کوڕەکە، لای خواوەندەوە پەسەند بێ، ئەوا کوڕەکە له جێگای خۆیەوە دەست به لەرزین و خۆڕاوەشاندن و (حاڵ) له خۆهێنان دەکات.. دەمی کەف دەچێنێ و بۆ ماوەی

سەعاتێك زیاتر، سەمایەكی توند و بەهێز دەكات. ئەمە نیشانەی ئەوەیە كە تروسكەی خواوەندی تێڕژاوە.. دوای ئەمە ماوەی (٧) رۆژ لە پەرستگادا دەمێنێتەوە، بەبێ ئەوەی قسە لەگەڵ كەسدا بكات، دوای (٧) رۆژە، دەبرێتە دەرەوەو قەشەیەك دەمی دەكاتەوە، بەنیشانەی ئەوەی ئیتر بۆی هەیە قسە بكات.. ناوێكی تازەشی لێدەنێن.. ئیتر لە دوای ئەمەوە، ناوی ((قەشە))ی لێدەنرێ.. ئەم قەشانەی خواوەند، لەكاتی ئەم (حاڵ) لێ هاتنانەدا هەر قسەیەك بەدەمیاندا دێت، بە قسەی خواوەندی دەزانن و خەڵكیش راوێژیان پێدەكات، بەرامبەر بەم راوێژەش شتێكیان دەدەنێ.. لە رووی یاساشەوە، لە گەڵێ (تاوان) دەبەخشرێن. تەنانەت لە رێگە و بانیشدا، كەس نابێ بەریان بكەوێت، ئەگەر بە رێككەوتیش بەریان بكەون، سزای گەورە دەدرێن، چونكە ئازاردانی ئەمانە، ئازاردانی خواوەندە.

بەڵام لە هەندێ جێگای وەك: (بابل و ئاشوور و میسر)دا، شاژنی گەورە دەبووایە هەر (كچ) بێت، بەتایبەتی لە بابلدا، كە دەبووایە ئەو كچە، بۆ هەمیشە لەناو كەژاوە تایبەتی و قەشەنگەكەی (مەردوخ)دا، كە لەناو پەرستگاكەدایە، رابكشێ.. گوایە ئەم كچە، خواوەند خۆی پاڵاوێتی و لەناو هەموو كچانی بابلدا هەڵی بژاردووە و لە هەمان نوێنی تایبەتی و كەژاوەی ناو پەرستگادا، دەستی لەگەڵ تێكەڵ كردووە.

هەمدیسان خواوەندی (خۆر ـ شمس ـ شاماس) لە بابلدا، چەند ژنێكی هەبووە، كە تایبەت بوون بۆ خزمەتگوزاری.. لە (میسر)یش هەمان دەستوور باوبووە، كە لەوێ ناونراوە: (هاوڕێ)، یان (دۆستی خواوەند). تەنانەت هەتا سەرەتای سەدەی زایینیش جوانترین كچی ماڵە خانەدان و گەورەكان، خۆیان بۆ نەزری خواوەند تەرخان دەكرد و دوای تەمەنی هەرزەكاری، بۆیان هەبوو كاری سێكس لەگەڵ هەر كەسێكدا، كە خۆیان بیانەوێ، بكەن، كە (شوو)شیان كرد، وایان دادەنا ئیتر مردوون... لە دوای مردنیش لە گۆڕی تایبەتیدا دەنێژران. ژنانی تر، كە سەر بە پەرستگا بوون، واتە لە هەمانكاتدا، سەر بە شاژنی گەورە بوون.

پێیان وتراوە (قادیشتو)، ئەو ناوەی کە هەمان ناوی جوولەکانەی (قدیشا) بووە، واتە (ژنە تایبەتی و تەرخانکراو)

هەر لە نزیك رۆخی (الذهب) لە ئەفەریقا، بە هەمان دەستوور، خواوەندەکانیان، کوڕ و کچی تایبەتیان هەبووە و بۆ هەر خواوەندێکیش، جۆرە نەریتێکی تایبەتی هەبووە، کە بە تەپڵ و مۆزیکەوە. ویردی بۆ خوێندراوە، لەو کاتانەدا کە (حاڵ)یان لێهاتووەو بە سەما، دەریانبڕیوە، خەڵکی پرس و راوێژیان پێکردوون، لەبەرئەوە (سەما) جێگایەکی گەورەو پیرۆزی بۆ پەروەردەکردنی قەشە و زێوانەکانی خواوەند هەبووە... پێش ئەوەش لەبەر چاوی خەڵکی سەمایان بکردایە، چەند مانگێ پێشتر، فێردەکران.

## ٥. پیاوانی پیرۆز لە رۆژئاوای ئاسیا:

هەروەك وتمان، ژنانی پیرۆزی رۆژئاوای ئاسیا (قدشوت) پیرۆز بوون.. بەو جۆرەش پیاوانی پیرۆز (قدشیم)، هاوتای پیرۆزیی ژنانی پیرۆز، پیرۆز بوون.. یان بە واتایەکی تر، هەر ئەم پیاوە پیرۆزانە لە پەرستگاکاندا تەواوکەری ژنە پیرۆزەکان بوون و وەك پیاوە پیرۆزەکانی ئەفەریقا، خۆیان وا دادەنا، کە رۆحی خواوەند، یان تروسکەی خواوەندیان تیدا تواوەتەوە. ئەمە کوتومت لە پەرستگای (مانگ)ی ئەلبانی دەچوو لە (قەفقاس)، ئەم پەرستگایە. زەوی و زارێکی بەرینی لە دەور بوو، کە کۆیلەی پیرۆزی تیدا دەژیا.. قەشەیەك ئەم پەرستگایەی بەڕێوەدەبرد، کە لە وڵاتدا لەدوای پاشا پلەی دووەم کەس بوو. هەر کۆیلەیەکی پیرۆزیش، لە کاتی (حاڵ) لێهاتنیدا، ئەگەر زۆر بەو حاڵەوە بمایەتەوە و بەدەم حاڵەوە سەری خۆی بەرەو دارستان و دەشت و دەر هەڵبگرتایە، قەشەی گەورە بە زنجیرێکی موبارەك دەیبەستەوەو تا ماوەی ساڵێك، لە جێگایەکی خۆشدا، دادەنرا و دوای ساڵەکە بەڕۆنی زەیت چەوریان دەکرد و دەیانبرد بۆ قوربانی (مانگ). جۆری قوربانییەکەش وەها بوو، کە یەکێك (کێرد)ێکی گەورەو موبارەك، بەدەستەوە بگرێت و چەند جارێك بیکات بەلای چەپی سنگیدا، تا بەر دڵی بکەوێت، ئەوسا کە کەوتە سەر زەوی،

وێردی بەسەرا دەخوێنن.. لە دواییدا هەڵیدەگرن بۆ جێگایەك، لەوێ هاوڕێ کۆیلە ـ پیرۆزەکانی، پێی موبارەکی بەسەردا دەنێن...

ئەم حاڵ لەخۆ هێنانە، بە وەحی و بە فەرمانی خواوەند زانراوە، بۆ نموونە راپەڕینی کۆیلەکانی (صقلیە) هەر بەهۆی کۆیلەیەکی (سوریا)ییەوە بوو، بۆ ئەوەی هاوڕێکانی بخرۆشێنێ، حاڵی لەخۆ هێنا و بەناوی خواوەندی (سوریا)وە، هانیدان کە هێرشبەرن، هەر بۆ ئەمەش پێغەمبەرەکەیان، بۆ ئەوەی زیاتر رقیان هەڵسێنێ، وای پێشانی هاوڕێکانی دا، تا ناخی ئەم کۆیلەیە گڕی خواوەندی تێبەربووە، بۆیە هات و هەر بەراستیی گڕی تێبریندار دەکەن! یەکێك لە پێغەمبەرانی کۆنی بەردا!.

جوولەکەکانیش بڕوایان وابوو، پێغەمبەرەکانیان، گیانی خواوەندیان تێدەڕژێ و بەناوی ئەوانەوە قسە دەکەن. لەبەرئەوە ئەو قسانەی ئەوان دەیکەن، قسەی خواوەندە، کەواتە سیمای نەریت و دەستووری پێغەمبەرانی (ئیسرائیل) و رۆژئاوای ئاسیا، زۆر لە یەك نزیك بوون، چونکە پێست رەشەکانی ئەفەریقاش، بۆ خروشاندنی گیانی هەڵچوون و حاڵ لێهاتن، موزیکییان بەکاردەهێنا، هەروەك ئەوانیش سەریان بەڕۆن زەیت چەور دەکرد و دەم و چاویان نیشانە و وێنەی جیاوازی وای تێدابوو، کە لە خەڵکی ئاسایی جیابکرێنەوە.. خەڵکیش لە خۆشی و ناخۆشی و کاروباری ژیاندا، پرس و راوێژی پێدەکردن.. بەرامبەر بەمەش شتێکیان دەدانێ.

لێرەوە شتێك بەبیر دێنینەوە، ئەویش ناوی (پێغەمبەر)ە لە کۆندا. پێشان بە پێغەمبەر وتراوە: (ئەو کەسەی پێشبینی دەکات یان: دەبینێ ـ غەیبزان ـ الرائی)، واتە ئەوەی کە دەتوانێ داهاتوو بزانێت، لەبەرئەوە هەندێ جار ئەو کەسەی مانگایەکی دزراوە، یان سکی پڕ بووە، بڕوای وابووە، کە پێغەمبەرەکەیان دەتوانێ بزانێ کێ مانگاکەیانی دزیوە، یان سکی بە کوڕ یان کچ پڕە! بێگومان ئەم باوەڕە، لای هەموو نەتەوەکانی سەرزەمین، لە کۆندا باوبووە، کە لە (بیبیلۆس)دا ـ شارە پیرۆزەکەی ئەدۆنیس ـ زۆر لەپێش جوولەکەکانیشدا پێغەمبەرایەتی باو بوو. دەڵێن جارێکیان گەڕۆکی میسری (ون

عەموون) لە بیبیلۆسدا بووە، پاشا فەرمانی پێکردووە کە بیبیلۆس بەجێبهێڵێ..
کەچی لە پڕێکدا یەکێك لە دەست و پێوەندەکانی پاشا، حاڵی لێهاتووە و بە پاشای ڕاگەیاندووە کە دەبێ ئەو گەڕۆکە، وەك نێردراوێکی تایبەتی لەلایەن (عەموون)ی خواوەندەوە ڕێزی لێبگیرێ. لەبەر ئەمە پاشا یەکسەر وای هەست کردووە کە ئەم دەست و پێوەندە لەلایەن ئەدۆنیس - ی پێغەمبەرەوە فەرمانی پێدراوە...

لەم کاتانەدا کە یەکێ: لەم دەست و پێوەندە، دەگاتە ئەو پلەیە، ئیتر بەچاوی ڕێزەوە سەیر دەکرێ و بە پلەی (کۆیلەی پیرۆز) واتە: قدشیم، ئەژمار دەکرێ.. کەواتە ئەگەر مەسەلەکە وابێ، مانای وایە جیاوازیی لە نێوانی پێغەمبەر و ئەم کۆیلە پیرۆزانە - قدشیم - دا نییە، چونکە هەردوو لایان پیاوی خواوەندن و خواوەند لەواندا خۆی دەنوێنێ... تەنیا جیاوازییان ئەوە بووە کە پێغەمبەر بۆی هەبووە بە ئارەزووی خۆی بگەڕێ، بەڵام کۆیلە پیرۆزەکان، دەبووایە هەر لە پەرستگادا بژین.

ئەم کۆیلە پیرۆزانە، یان ئەم پیاوە پیرۆزانە، ڕۆژ دوای ڕۆژ لەناو خەڵکدا باوەڕیان زیاتر پێکراوە، تا هەندێجار پێیان وتراوە: (وەلی). ئەم وەلی - یانە، زۆرجار ژنان باوەڕیان وابووە کە ناتوانن خۆیان بەدەستیانەوە نەدەن، چونکە بە فەرمانی خواوەند بەدەسەڵاتن، ئەگەر منداڵیشیان لە هەر ژنێك ببێ، منداڵەکە موبارەك و پیرۆز دەبێ.. لەبەرئەوە تائێستاش، لە گەلێك شوێندا، واباوە کە ئەم وەلیانە دەتوانن سك پڕ بکەن، بۆیە ژنان دەچنە سەر گۆڕ و بە زیندووییش دەچنە زیارەتیان و تیایاندا دەپاڕێنەوە، تا سکیان پڕ بکەن، ئیتر دوای ئەمە، هەر ژنێك سکی پڕ بووایە و منداڵی ببووایە، بە منداڵەکەیان وتووە: منداڵی خواوەند، یان کوڕی خواوەند، بۆیە جارێکی تر ئەم کوڕانە بۆ خزمەتی پەرستگا نەزر دەکرانەوە.

ئەم نەریتە هێشتا لای زۆر لە گەلانی سەر ڕووی زەمیندا پاشماوەو بۆن و بەرامەی هەر ماوەو لەجێی ئەو پێغەمبەر و کۆیلە و وەلیانە، پیاوچاکانی ئایینەکان، تکایان لێ دەکرێ تا سکی ژنان پڕ بکەن.. ئەمە ئەگەر ناواخنێکی

قوولّی هەبێ. هەر ئەو ئەنجامە بەدەستەوە دەدات، کە بۆ مانەوەی مرۆڤ، لەسەر رووی ئەم زەمینە، داوا دەکرێت مرۆڤی تر لەدایك ببێ و شوێنەواری مرۆڤ کوێر نەبێتەوە. ئەم داوای کوێر نەکردنەوەیەش هەر تەنیا لە یەزدان و خواوەند داوا کراوە، کە هەر تەنیا ئەو دەتوانێ خۆی بهاوێتە رۆحی ژن و پیاوەوە.. بەڵام ئەمە هەر لە رۆژئاوای ئاسیادا باو نەبووە، بەڵکو لە زۆر جێگای تردا کتومت ئەم منداڵانەیان بە کوڕی راستەقینەی خواوەند زانیوە، لەو بڕوایەوە کە خواوەند خۆی رژاوەتە رۆحی دایکیانەوە.

تا ئەم دواییانەش لە (سوریا) وا باوبووە کە مەرج نییە هەموو منداڵ بوونێك لە رێگای دەست تێکەڵکردنی ژن و پیاوەوە بێ، بەڵکو ژنە نەزۆکەکان، دەچوونە سەر گۆڕی مێرد و پیاو چاکانی مردوو، بە ئومێدی ئەوەی رۆحی ئەو مردووانە، دەتوانێ بچێتە ناو منداڵدانی ئافرەتەکەوەو منداڵی بۆ دروست بکات.

هەر هۆزەکانی (هورون)ی هیندییە سوورەکان، کە منالّیدان بمردایە، لە نزیك سەر رێگەی کاروانیی و سەرجادەکاندا دەیانناشتن، بە نیازی ئەوەی بەڵکو رۆحی ئەو منداڵە بچێتەوە ئافرەتێك و هەمدیسان سکی پڕ بێتەوە..

پێست رەشەکانی رۆژئاوای ئەفەریقاش منداڵی مردوویان لەناو دارستانەکاندا فڕێدەدا. گوایە رۆحی دەچێتە سەر درەختەکان، بەتایبەتی درەختی (مۆز)، بۆیە لە (باگندا)ی ناوەڕاستی ئەفەریقا، بڕوایان وابوو کە (گوڵی مۆز)، بەسەر هەر ئافرەتێکدا بکەوێتە خوارەوە، ئیتر ئەو ئافرەتە سکی پڕ دەبێ، لەبەرئەمە ئەو ئافرەتانەی ویستوویانە سکیان پڕ بێ، لە درەختی (مۆز) پاڕاونەتەوە، چونکە گوڵی مۆز، رۆحی منداڵە و ئافرەتان خۆیان بانگ دەکەن بۆ لای، تا جارێکی تر بچنەوە سکیان.. لەم ناوچانەدا هەر ئافرەتێك تاوانبار بکرایە کە سکی بە حەرامیی پڕ بووە، یەکسەر دانەدەما و دەیووت: منداڵەکەم کوڕی مۆزە...

هۆزەکانی (کۆنگۆ)ی خوارووش، هەمیشە منداڵی شیرەخۆرەیان بە مردوویی، لای دایکیانەوە ناشتووە، تا، جارێکیتر رۆحیان بۆناو منالّدانی دایکیان بگەڕێتەوە... لە پەرستگای گەورەی (ئیسکۆلابیوس)دا، ژنان بە نیازی سك پڕ بوون، دەچوون لە پەرستگاکەدا دەخەون و ئەگەر خەونیان بەنێرە مارەوە

بدیبایە، مانای ئەوە بوو، سکیان پڕ دەبێ، گوایە خواوەند چەند جارێك لە شێوەی (مار)دا بینراوە، بۆیە کە ماریان دیوە، وتوویانە ئەمە خواوەند خۆیەتی. کە منداڵیشیان بووە، پێیان وتووە: کوڕی مارە... هەر لەبەرئەمەش بووە بە چاوی رێزەوە سەیری مار کراوە، یان لە زۆر جێگادا هێلانەیان بۆ مار دروست کردووەو بەخێویان کردووە و شیریان داوەتێ، چونکە شیر بە مۆرڤ دەدرێ، ماریش بنەچەی مرۆڤە و دەتوانێ جارێکیتر ببێتەوە بە مرۆڤ.. زۆرجاریش نەخۆشیان بردۆتە سەر (مار) بۆ چاك بوونەوە..

هەر خەڵکی (سیکیۆنی)یش خۆیان وتوویانە، کە (ئاراتوس)ی سیکێونی بەناوبانگ، کوڕی (ئیسکۆلابێوس)ەو دایکی دەستی لەگەڵ (مار)دا تێکەڵ کردووەو سکی پێی پڕ بووە، رەنگە دایکیان لە پەرستگای ناوبراودا بە نیازی منداڵ بوون، خەوتبێ، کە لە پەرستگاکەدا، پەیکەرێکی ئیسکولابیوس، لەسەر پەیکەرێکی ترس؟، مارێکی پەپکە خواردوو دروستکراوە، یان لە پەرستگای (تیتانی)دا خەوتووە، کە ئەمی دواییان، تێچوونی بۆ زیارەتی، سەخت و گران بووە..

دەگێڕنەوە کە دایکی (ئەغسطوس قەیسەر)یش لە پەرستگای (ئۆپۆلۆ)دا خەوتووەو سکی بەمار پڕ بووە، بۆیە بەم پاشایەیان وتووە کوڕی خواوەند..

هەر لەم بابەتە باسانەوە وتراوە ـ کە پاڵەوانی (مسینا) ـ ئەرسطوینیس ـ و ئەسکەندەری گەورە و سکێبۆری گەورە، هەموویان کوڕی مارن و باوکیان مار بووە. هەر لە زەمانی (هێرۆدۆتس)یشدا، وتراوە کە مارێك لەگەڵ کیژۆڵەیەکدا دەستی تێکەڵ کردووەو منداڵی لێیبووە...

لە پەرستگای (ئەربکثیوم) لە (ئەثینا)، مارێکی پیرۆز هەبووە، مانگی جارێك قاپێ هەنگوینیان داوەتێ، گوایە ئەم مارە، گیانی (ئەربکثیوس)ی پاشای یۆنانی تیدایە، لەوەش دەچێت یۆنانیگەلی کۆن، لەوەدا کە (شیر)یان بەسەر گۆڕدا رشتووە، مەبەستیان پاراوکردنی ماری گۆڕستان بووبێ، چونکە لەسەر پارچە تابلۆیەکی دۆزراوەی گۆڕی (تیغیا)، وێنەی ژنێك و پیاوێك دروستکراوە، جامێك شیر بە مارێك دەدەن..

له (تسموفوريا)ش له سەرەتای وەرزی تۆو وەشاندندا، خواردن و کێك بۆ ئەو مارانە فڕێ دەدەن، کە لەم ئەشکەوتانەدا دەژین، بەئومێدی ئەوەی ئەم مارانە، لەوەرز و کاتی تۆو وەشاندندا، بە وڵاخ و گاجووت و جووتیارانەوە نەدەن و بە گەستنیان کاری کشتوکاڵ دوانەکەوێ..

کەواتە سەیر نییە ئەگەر لە ڕێگای دیارییەوە، گیروگرفت لە مرۆڤ دوور بخرێتەوە، هەرچەندە کشتوکاڵ کردن، خۆی لە خۆیدا کارێکی پێچەوانەی نەرێتە، چونکە بە کشتوکاڵ کردن، زەوی واتە (دایك) بریندار دەکەن! یەکێك لە پێغەمبەرانی کۆنی پێست سوورەکانی سەر رووباری کۆڵۆمبیا، سەبارەت بە زەوی کێڵان وتوویەتی: (گوناح نییە، دایکمان بریندار و شەقار بکەین؟!. تۆ داوام لێ بکەیت زەوی بکێڵم، وەك ئەوە وایە: چەقۆیەك هەڵگرم و سنگی دایکمی پێ هەڵدڕم! تۆ داوام لێبکەیت بەرد لە زەوی دەربهێنم، وەك ئەوە وایە پێم بڵێیت: دایکت پارچە پارچە بکە و ئێسقانەکانی دەربێنە! تۆ داوام لێبکەیت ـ گیا ـ بڕنم و وشکی بکەمەوەو بیکەم بە (کا) و بیفرۆشم و دەڵەمەند بم! وەك ئەوە وایە قژی دایکم دەستکەنە بکەم!).

ئەمانە و لە هەمانکاتیشدا، لای هەندێ هۆزی ئەفەریقا، بڕوایان وابووە کە گیانی هەموو مارێکی مردوو، پاسەوان و چاودێرکەری مرۆڤێکە، بۆ ئەمە هەرکەسێکیان دەمرێ. نایبنێژن و نایشارنەوە، بەڵکو لە نزیك گردۆڵکەیەك دایدەنێن و رۆژانە ژەم بە ژەم، نانی بۆ دەبەن، ئینجا ئەگەر، رۆژێك لە رۆژان هەستیانکرد، لاشەی مردووەکە، دیار نەماوە، وتوویانە: بۆتەوە بە رۆحە پاسەوانەکە: (توا). یان ئەگەر مارێك بە ماڵی یەکێکیاندا رابوورێ، یەکسەر وتوویانە ئەوە گیانی خواوەندەو سەری لێداوین، بۆیە لەم کاتانەدا بە ترس و سڵەوە، وێردی بەسەردا دەخوێنن و بە کڕنۆش و چەمینەوەوە، دیاری بۆ دەبەن، ئەگەر ئازاریشیان بدات، ناتوانن بیکوژن، چونکە لایان وایە کوشتنی مار، بە زیانێکی گەورەو زیان بەخش، دەگەڕێتەوە سەریان...

لای رۆمان و یۆنان ـ یش مار پیرۆزەو لە ئەفسانەی کۆنی یۆنانیدا (قەدموس و هارمۆنیا)ی ژنی، لە کاتی مردنیاندا، بوون بە مار، دەشڵێن پاشای ئیسپارتە

(کلیوفییس) کە لە میسر کوژراو چوار مێخەدرا، مارێك پیایدا هەڵگەڕاو داڵ و باز و باڵندەی لەسەر دوورخستەوە.

دیسان (بلوطینوس)ی فەیلەسووفیش، کە لە گیانەڵادا بوو، مارێك لەژێر جێگاکەیەوە هاتە دەرێ و لە درزی نێوان بەردی دیوارەکەدا، گوم بوو.. بەو گوم بوونەش فەیلەسووف گیانی دەرچوو! !

لە سەرووی هیندستانیش منداڵی مردوویان لەبەر دەرگای ماڵدا دەناشت. چونکە دایك و باوکی، بەسەریدا رادەبوورن و رۆحی تێیان دەچێتەوە، هەر ئەمە وای لە (هیندۆکی)ییەکان کردووە، کە تەرمی منداڵ نەسووتێنن، بەڵکو بینێژن. ئەگەر منداڵە مردووەکە، شیرە خۆرە بێت، لە دوای سێ رۆژ، دایکی شیر بەسەر زەویدا دەڕێژێ، گوایە منداڵ زۆر حەزی لە شیرە و بۆی زیندوو دەبێتەوە.

لە ناوچەکانی (ئەمبالا و گەجرات)یش باوەڕ وایە ئەگەر سەگ و دڕندەی کێوی، گۆڕی منداڵەکە هەڵبدەنەوەو لە شار نزیکی بخەنەوە، ئەوا منداڵەکە هەمدیسان لە منداڵدانی دایکیدا زیندوو دەبێتەوە، لەناو خێزانی تردا زیندوو دەبێتەوە، بۆیە هەر منداڵێك کە دەمرێت، رۆژێ دوای مردنەکەی، بەیانی زوو دەچنە سەری، بزانن دەرهێنراوە یا نا؟! تەنانەت ئەوەندە بڕوایان بەو گەڕانەوەو زیندوو بوونەوەیە هەیە، کە منداڵێك دەمرێ، دایکی پارچەیەك لە کراسەکەی خۆی دەخاتە کفنەکەیەوە، بەڵکو منداڵەکە بەهۆی ئەو پارچە کراسەوە، دایکی بیر بکەوێتەوەو یادی بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای. یا بە پێچەوانەوە، ئافرەتی نەزۆك، پارچەی کراسی منداڵی مردوو، بە جلوبەرگی خۆیەوە دەدوورێ...

هەر لە هیندستان، گەلێ ژنی نەزۆك، منداڵی نێرینەیان کوشتووەو لەسەر تەرمەکەی خۆیان شتووە! لەم نزیکانەی دوایشدا روویداوە، بێجگە لە کوشتنیش، بە خوێنەکەی خۆی شتووە، هەر بۆ ئەوەی سکی پڕ بێت!..

دانیشتووانی (گندا)ش باوەڕیان وایە پێنج رۆژ دوای مردنی مردووەکە، دەچنە سەر رووبارێك، چەند جارێك بەدەم هاوارەوە بانگی مردووەکە دەکەن، ئینجا خۆیان فڕێدەدەنە رووبارەکەوە، لەناو رووبارەکەدا دەست دەگێڕن، ماسی، یان هەر شتێکیان بەرچنگ کەوت، ئەوە مانای وایە مردووەکەیان رۆحی چۆتە ئەو

شتەوە، ئیتر لەگەڵ خۆیان دەیبەنەوەو لەگەڵ گۆڕی مردووەکانیاندا دەینێژن.. یان هەندێ جار ئافرەتێك، ئەو شتە دەخوات، بە ئومێدی ئەوەی رۆحی مردووەکەی تیدا زیندوو بێتەوە..

لای (صقالب)ییەکانی خوارووش، ئافرەتانی نەزۆك دەچنە سەر گۆڕی ئەو ژنانەی بە سك پڕیی مردوون، هەندێ گیای سەر گۆڕەکەی دەخۆن و بەسەریدا دەگرین تا منداڵەکەی خۆی بە یەکێکیان ببەخشێت. پاشان مشتێك گڵی سەر گۆڕەکەی هەڵدەگرن و بۆ هەمیشە ئەو مشتە گڵە، لە (ناو گەڵ)یاندا هەڵدەگرن، چونکە لایان وایە رۆحی منداڵەکە، لەناو گیاو گڵەکەدایە و تیایاندا زیندوو دەبێتەوە..

ئەم هەموو بەڵگانە، نیشانەی ئەوەن کە لەناو ئەم هۆز و نەتەوانەدا، باوەڕ وایە منداڵبوون لە ئەنجامی تێکەڵ بوونی ژن و پیاوەوە نییە، بەڵکو شتێکە لە سەرووی ئەمەوەیە، ئەگینا ئەی بۆچی ژن و مێردیش هەن و منداڵیشیان نابێ!؟ ئەمە لە گەلێك ناوچەی (ئوستراليا)شدا، واباوە کە رۆحی یەکێك لە مردووەکانی خێزانەکە، لە رێگەی (ناووك)ەوە دەچێتەوە ناو سکی ئافرەتێکیان و دەبێتەوە بە مرۆڤ! ئیتر ئەم رۆحە، پێش ئەم ژیانەوەیە، دەگونجی لە درەختێکدا، یان لە کونە بەردێکدا بێ، بۆیە هەر لە (ئوستراليا) لە هۆزی (ئەرنتا)، بەردی گەورە گەورە هەن، وادەزانن ئەم بەردانە مەڵبەندی رۆحن! لەبەرئەوە ئەگەر ژن و مێردێك منداڵیان بوێت، دەچنە سەر ئەم بەردو درەختانە.. پیاوەکە لکێکی ئەم شتەی (دەیبەستێ بە سەریەوە)، دەیبەستێ بەم بەردو درەختانەوە، وێردی بەسەردا دەخوێنن و داوای لێدەکەن منداڵیان ببێ، کە بەلای ئەم درەخت و بەردانەدا تێپەڕ دەبێ، رووداوکات بەولاوەو پێیان دەڵێ: هۆ درەختەکە! یان هۆ بەردەکە! من تازە پیر بووم (ئەگەر گەنجیش بێ) پێویستیم بە منداڵ نییە...

ئەم درەخت و بەردە پیرۆزانە، لای (سامی)ییەکانیش هەر باوبووە، بۆ وێنە، کە (ئەرمیا)ی پێغەمبەری جوولەکە بە درەختێك، یان بە بەردێك دەڵێ: تۆ باوکمیت! یان تۆ منت دروست کرد، هەر پێڕەوکردنی نەریتی پێشینیانێتی، چونکە لە پەرستگا کۆنەکانی (کەنعانی)دا، (تا سەردەمی چاکسازیی ئایینی (**زمن الاصلاحات الدينية**)ش، کە (حزقيا و يوشعيا) دەستیان پێکرد، چڵە درەخت (ئاشيراه) و بەردی پیرۆز

(مسیباه) دەپەرستران. ئەم دەستووره هەمیشه بووه به قەڵغانێك بۆ (پیاوان و ژنانی پیرۆز ـ قدیشیم ـ و قەشوت)، که لەم پەرستگایانەدا دەست بکەن به داوێن پیسی و ئیشی خراپه. کاتێ منداڵیشیان بوو، بڵێن: منداڵی درەخت و بەردە ! چونکه لەناو پەرستگاکاندا درەخت و بەردی پیرۆز هەبوون و پەرستراون.. وتووشیانه ئەم درەخت و بەردانه، هەمیشه چاوەڕێی ئەوه دەکەن، یەکێك مرد، رۆحەکەی بقۆزنەوەو دوایش بیدەنەوه به خەڵکی تر.. خەڵکه ساویلکه رەشۆکییەکەش، ئەم ژن و پیاوه پیرۆزانەیان به نوێنەری خواوەند و نەریتی ئەو درەخت و بەردانه زانیوه و سیمای ئەو پیاوانەیان به درەختێکی هەڵپاچراو و هەتا ژنیشیان به بەردێکی تاشراو زانیوه.. ئەوەی زیاتر ئەمانه دەسەڵمێنێ، لەم دواییانەدا له شاری (غەزر)ی کەنعانی، هەندێ شت دۆزراوەتەوه...

له (کونیزلند)یش دانیشتووانی گوێ رووبار (تلی)، بڕوایان وایه که منداڵ بوون، هەرگیز بەهۆی تێکەڵبوونی ژن و پیاوەوه نییه و ئەم تێکەڵ بوونه هەر تەنیا بۆ (ئاژەڵ)ه و مرۆڤ دەبێ له ئاژەڵ بەرزتر بژی.. بۆیه لای ئەمانه له رێگای ئەم چوار شتەوه منداڵ دروست دەبێ:

١- مێردی ژنەکه، ماسی بگرێت و بۆی ببرژێنێت.. بەبۆنی ئەو برژاندنه، سکی پڕ دەبێ.

٢- ئافرەتەکه بەدەستی خۆی، جۆره (بۆق)ێك هەیه، ئەگەر بتوانێ بیگرێ، ئەوا سکی پڕ دەبێ.

٣- پیاوێك (هەر پیاوێك) فەرمان به ژنەکه بکات سکی پڕ بێت.

٤- ژنەکه خەون ببینێ، له خەونیدا منداڵێك له سکی دانێن.

هەر له (کونیزلند)، له ناوچەی (سەری بودفۆرد) لایان وایه، منداڵ دروست کردن (قژ درێژێك) دروستی دەکات.. ئەم قژدرێژه چوار چاوی هەیه، دووان له پێشەوەو دووانیش له دواوه، لەناو زەل و قامیشەڵاندا دەژی.. ئەم منداڵانه لەوپەڕی رۆژئاواوه به تەواوی دروست دەکرێن، بەڵام که بەدەم رێگاوەن بچنه منداڵدانی ئافرەتێکەوه، له رێگا دەبن به مار (ئەگەر کوڕ بن)، یان به چۆلەکه (ئەگەر کچ بن)، ئینجا ئەگەر پێ رەشەکان گوێیان له دەنگی چۆلەکه و فیشکەی مار بوو، ئەوا دەم و دەست دەڵێن:

منداڵێك بە رێگاوەیە بێتە ئەم نزیکانە.. ئەگەر ژنێکیش لەناو زەل و گژوگیادا، مارێکی جوانی بینی، یەکسەر ژنانی تر بانگ دەکات و دەکەونە گەڕان بۆی، خۆ ئەگەر نەیاندۆزییەوە، دەڵێن: رۆحی کوڕێك چووە یەکێکمانەوە..

هەر لە دەوروبەری رووباری (بنگازر)ی ئەم وڵاتە، منداڵ دروستکەر هەیە، ئەم منداڵ دروستکەرە، بە قوڕ، شێوەی منداڵێك دروست دەکات و دەیکا بە ژنێکدا.. باوەڕی تریش بۆ منداڵ دروست بوون، هەر لەم وڵاتەدا، ئەگەر ئافرەتێك، خواردنی پیاوێك وەربگرێت، نەك هەر دەبێ بە ژنی، بەڵکو منداڵیشی لێی دەبێت. یان ئەگەر پیاوێك بچێت بۆ راو، ئەو نێچیرەی کە راوی دەکات، ئەگەر ژنەکەی بیخوات سکی پڕ دەبێت... کە سکیشی پڕ بوو، ئیتر نابێ نێچیری تر بخوات، تا دانانی ئەو منداڵە دەردێت، کە بە بەریەوەیەتی..

ئەم هەموو نەریت و ئەفسانە و بەڵگە سەیر سەیرانە، ئاخۆ ئەوەمان بیرناخەنەوە، کە ئەفسانەی سك پڕبوونی (مریم)ی دایکی (عیسا)ش، پێشینیان بە شتێکیان زانیوە لەمجۆرە بابەتانە؟!

## ٦ ـ سووتاندنی ملکارث:

له (صور) و ناوچەکانی سەر بە صور، قوربانی بۆ خواوەند، زۆرجار منداڵ و کوڕ و کچیان سووتاندووە، چونکە ساڵانە ئاهەنگی سووتاندنی خواوەندی (ملکات) بووە، بۆیە کە زۆربەی گەل وای کردبێ، هەندێ جار پاشای وڵاتیش پێی ناوە بە جەرگی خۆیدا و منداڵی خۆی سووتاندووە. بۆ وێنە (شا موئاب)، کوڕەکەی خۆی سووتاند، گوایە کوڕی خواوەند خۆیەتی و بۆ باوەشی خواوەند دەگەڕێتەوە..

سەرچاوەی ئەم نەرێتە، لە دروستکەری خوایەتی (بیبلوس)ەوە بەجێماوە، ئەمانە هەر لە(بیبیلۆس)یشدا، ئەو کەسەی نوێنەرایەتی ئەدۆنیسی کردووە، خۆی سووتاندووە، هەندێ جار لەجیاتی ئەوەی قوربانییەکە، مرۆڤ بێ، پەیکەرێك بووە لە شێوەی مرۆڤدا، پێیان وتووە (ملکارت). ئەم ملکارتە لە یۆنان پێیان وتووە: (هەرکوڵ)، کە گوایە ئەمیش لەناو ئاگرێکی گەورەدا خۆی سووتاندووەو دووکەڵەکەی لەگەڵ هەورە بروسکە وناڵەناڵێکی زۆردا بۆ ئاسمان بەرزبۆتەوە..

ئەم چیرۆکەی (هەرکوڵ)، کە (سۆفوکلیس) دەیگێرێتەوە، لەسەر شاخێك بووە، کە ناوی (ئاتیا) بووە، بەڵام هینەکەی (صور)، وازانراوە کە هەموو ساڵێك لە ئاهەنگێکی گەورەدا، ئاگرێك دەکەنەوە، ئەم ئاهەنگەیان ناو ناوە: (راپەڕینی هەرکوڵ، یان ملکارت)، چونکە چیرۆکەکانی یۆنان دەیگێڕنەوە، کە (هەرکوڵ)، لەکاتی سەردانیدا بۆ (لیبیا) کوژراوە. بەڵام (تایفوت) ناوێك، زانیوێتی کە (هەرکوڵ) کاتی خۆی حەزی لە چۆلەکەی برژاو کردووە، بۆیە چۆلەکەیەکی برژاندووە و بردوویەتی لە لووتی نزیك خستۆتەوە، ئیتر (هەرکوڵ) کە بۆنی چۆلەکەی بە لووتدا چووە، زیندووبۆتەوە..

لە (قادس)یش، کە کۆنترین ناوچەی سەر بە (صور)ەو لەسەر رۆخی (ئیسپانیا)یە، پەرستگایەکی (هەرکوڵ ـ ملکارت) هەیە، کە هەرچی پەیکەر و شت هەیە، تێدا نییە، تەنیا ئاگرێك نەبێ، کە هەمیشە دەسووتێ، زێوان و قەشەی

تایبەتی سەرتاشراو و داوێن پاك، هەمیشە خەریکن خۆشی دەکەن و ڕێگاش بە ژن و بە بەراز نادەن تێی بچن. زۆربەی ناودارانی (ڕۆما)ش، سالانە ئەگەر ئیشێکی سەختیان لە بەر بووبێ، (حەج)یان بۆ کردووە. دوای سەرگرتنی ئیشەکەش دیاری زۆریان بۆ هێناوە..

(هانیپال)ی (ڕۆمان)یش پێش ئەوەی هێرش بەرێتە سەر (ئیتالیا)، چووە بۆ (قادس) بۆ حەج و نوێژی لەبەردا کردووەو لێی پاڕاوەتەوە، کە لەو هێرشەیدا یارمەتی بدات، بەلام خواوەند یارمەتی نەداوە.. لێرەش (قادس) هەروەك دەستووری (صور)، هەموو سالێك لە شێوەی پیاوێکی زۆر گەورەدا پەیکەرێکیان کردووە بە سواری ئەسپی زەریاوە، لە ئاهەنگی سالانەدا سووتاندوویانە.

بەلام لەکاتی ئاهەنگگێڕاندا، دەبووایە هەرچی (غەریب)ێك لە شاردایە، چۆڵی بکات.. یۆنانییەکانیش شتێکی لەم بابەتەیان کردووە، بەوەی خواوەندی زەریا (ملکرتیس)یان کردووە، کە ناوەکەی لە (ملکارت)ەوە نزیکە. ئەم پەیکەرەیان سواری (دۆلفین) کردووە. کە جۆرە ماسییەکی تایبەتییە...

لە (قرطاجە)ش، کە ناوچەیەکی گرنگی سەر بە (صور) بووە، خواوەند لەوێش سووتاندنی باوبووە، وەك لە بەسەرهاتی (دیدۆ)، یان (ئەلیسا)دا هاتووە، ئەم (دیدۆ ـ ئەلیسا)یە، ژنە پاشاو دروستکەری شارەکە بووە، دەلێن لەسەر کۆشکەکەی خۆیەوە، خۆی فڕێداوەتە ناو ئاگرێکی گەورەوە، یان لەناو ئاگرەکەدا لە داخی دلدارەکەی خۆی داوەتە بەر خەنجەر، کە خۆشی نەویستووە، یان بەجێیهێشووە... بۆیە دوای ئەم، ئیتر هەموو دانیشتووانی (قرطاجە) پێڕەوییان کردووە.. تا دەگێڕنەوە یەکێك لە پاشاکانی قرطاجە، (هملقار)ی ناوبووە، لە شەڕی (هەمیرا)دا، کە لەگەلّ یۆناندا کردوویەتی، زۆربەی سەربازەکانی، وەك قوربانی بۆ خواوەند فڕێداوەتە ئاگرێکەوە، تاسەریان بخات! ئیتر کە سەیری کردووە، سەربازەکانی وردە وردە کەم دەبنەوە، خۆیشی خۆی فڕێداوەتە ئاگرەکەوە، دوای ئەمیش بە ماوەیەکی زۆر، خەلکی ولات پێڕەوییان کردووە و پەیکەرێکی شەڕەفمەندانەشیان بۆ دروستکردووە، چونکە لەکاتی تەنگانەی ولاتەکەیدا، خۆی سووتاندووە.

بێجگە لە ئەو ناوچانەی ناومان هێنان، لە شاری (ئەبرین)یش خواوەندێك هەبووە، پەستراوە (ئەبرین)یش کەوتۆتە ناو ریزشاخەکانی (تورۆس)ەوە، ئەم خواوەندە رەمزی پیت و هاتی زەوی بووە، چونکە ئەو پەیکەرە جێماوانەی لەم ناوچەیە دۆزراونەتەوە، هەندێکیان پەیکەری خواوەندێکی بچکۆلەیە، لەبەردەم خواوەندێکی گەورەتری ریشندا، کڕنۆشی بۆ بردووەو نوێژی بۆ دەکات، پەیکەرە گەورەکەیان لە شێوەی (شاخ)دا، چەند جووتە شاخێك، لەسەری دەرچووە، کراسێکی ئاسایی لەبەردایە، مەچەکەکانی بازنیان تیدایە، بەدەستی راستی هێشوویەك ترێی هەڵگرتووەو بەدەستی چەپیش، چەپکێ گوڵەگەنمی لاسك درێژی هەڵگرتووە، ملوانکەیەکی گەورەشی لە ملدایە، هەردوو دەستیشی نیمچە هەڵبڕینێك هەڵبڕیوە، وەك بپاڕێتەوە.. لەوە دەچی ئەم پەیکەرانە، لەجیاتی سەردار و میری رابووردووی خۆیان دروست کرابن، ئەو سەردار و میرانەش لەبەرئەوەی هەر خەریکی مەڕو ماڵات بەخێوکردن بوون، رایان وابووبێ کە (گا) رەمزی زاو و زێ کردنە، بۆیە پەیکەرەکان قۆچ (شاخ)یان هەیە، لە پاڵ ئەمانیشدا (حثی)ییەکانیش کە هەر لەم ناوچەیەدا بوون، (گا) پەرست بوون و (بەران)یان بۆ کردووە بە قوربانی. هەرچەندە ئەم پەیکەرانە ناویان نییە، بەڵام نووسینی سەر پەیکەرەکان و جلوبەرگیان، کوتومت، تایبەتە بە رۆژهەڵاتەوەو هیچ پێوەندی بە خواکانی رۆمان و یۆنانەوە نییە..

ئەم خواوەندانەش هەروەك (ملکارت) لە ئاهەنگی ساڵانەدا، لە ئاگردا سووتاندوویانن، لەسەر گڕی ئاگرەکەش پەیکەری (هەڵۆ)یەکیان دروستکردووە، باڵەکانی فش کردۆتەوەو ئامادەی فڕین بووە، نیشانەی ئەوەی کە (هەڵۆ) کە، پاش سووتاندنی خواوەند، گیانی خواوەند لەگەڵ خۆیدا بۆ ئاسمان هەڵدەگرێت.. دەشێ رۆمانییەکانیش وەرگرتبێ، چونکە لای (ئەراکیت)، کە پاشایەك مردووەو کوڕێکی لەپاش بەجێماوە، پەیکەرێکیان لە مۆم دروست کردووەو فڕێیان داوەتە ئاگرێکەوە..

ئەو پارانەش کە لەم ناوچانەدا دۆزراونەتەوە، وێنەی خواوەندێکی ئاسیایی تیدایە، سواری شێرێکی شاخدار بووە، ئەم خواوەندە لە هەندێ وێنەی تردا،

ریشدارەو لە هەندێکی ترا باڵدارە و تەورێکی دوو دەم، یان شمشێرێکی بەدەستەوەیە.

لە شاری (هیرابولیس)ی سوریا، گەورەترین جەژنیان، جەژنی (سووتاندن) بووە، کە لە سەرەتای بەهاردا کردوویانە. لەم جەژنەدا خەڵك چڵ و لقی درەختیان بڕیوەو لە دەوروبەری پەیکەرەکاندا چەپاندوویانە، ئەوسا لاشەی بەرخ و بەران و چۆلەکەیان پێدا هەڵواسیون و ئاگریان تێبەرداون، دیارە سووتاندنی ئەم شتانە لە پێشتردا، ئادەمیزاد بووە، بەڵام کە خەڵکی قێزیان لەو جۆرە قوربانییە کردۆتەوە، گۆڕیویانە بەشتی تر.. لەکاتی سووتاندنەکەشدا، پۆلە کۆتریان فڕێ داوەتە ناو ئاگرەکەوە، تا بسووتێن، گوایە کاتی خۆی (ئەفرۆدێت ـ عەشتار)ی دڵداری ئەدۆنیس، زۆر کۆتری خۆش ویستووە.. ئەمەش نموونەی ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەفرۆدێت ـ عەشتار، خۆشەویستی خۆی پێشکەش بە ئەدۆنیس دەکات، بە واتایەکی تر ئەفرۆدێت خۆی پێشکەش ئەدۆنیس کردووە.

لەوانەیە ئەم بیری خۆسووتاندنە لە سەرەتادا نەریتێکی زۆر پێویست و باو بووبێ، بەڵام وردە وردە کەمتر بووبێتەوە، تا وای لێهاتووە لەجیاتی خۆ سووتاندن، دەبووایە، بەناو ئاگرێکدا تێپەڕ بێ.. دوای ئەمیش کردوویانە بەوەی لەجیاتی خواوەند، پەیکەری رەمزیی بسوتێنن...

## ٧. سووتاندنی قوربانی لای ئاشووری و فارسەکان:

هەر لە باسی سووتاندنی قوربانی و خۆ سووتاندندا، دەگێڕنەوە کە (سەردنابالس)ی پاشای ئاشووری، کاتێ لە شەڕێکدا خەریك بووە دەستگیر بکرێ، ئاگرێکی گەورەی کردۆتەوە، هەرچی خشڵ و چەك و دەست و پێوەندی ناو کۆشکەکەی و ژنەکەشی لەگەڵ خۆیدا فڕێداوەتە ئاگرێکەوەو خۆی سووتاندووە... بۆیە دوای ئەم خۆسووتاندنە، نەوەکانی دوای خۆی، پەیکەرێکی گەورەیان بۆ کردووەو وێنەی پاشایان تیدا هەڵکۆڵیوە.. ئەم کارەساتە هەر لە بنەچەی ئاشوورییەکاندا، چەند جارێکی تریش روویداوەتەوە، بۆ وێنە کاتێ (ئاشوور بانیپاڵ)، (شاماش شمولێن)ی برای دەکات بە فەرمانڕەوای (بابل)، لێی هەڵدەگەڕێتەوەو دەیەوێ دەسەڵاتی ئاشوور بانیپاڵ، بخاتە ژێر چنگی خۆیەوە، هێرش دەهێنێتە سەر ئاشوور، بەڵام کە دەرەقەتی ئاشوور نایەت و لە گەرمەی شەڕەکەدا خەریکە دیل بکرێ، دەگەڕێتەوە کۆشکەکەی خۆی و دەرگا لەخۆی و ژن ومنداڵ و کەنیزەك و نۆکەر و دەست و پێوەندەکانی دادەخات، ئاگر لە خۆی و لە هەموویان بەردەدات.. چەند ساڵێکی تریش دوای ئەم بەسەرهاتە، دووبارە بۆتەوە، کاتێ (سنیشار یشکرن)ی دوا پاشای ئاشووری، لە ئەنجامی هێرشێکی دوو قۆڵی: (نەبو پلاسەر)ی پاشای بابلی و (کیا کساریس)ی پاشای (ماد)ەوەکانەوە گەماردراوە، پێڕەوی نەریتی باپیرانی کردووەو خۆی سووتاندووە..

فارسەکانیش، کاتێ (ئەکرو بسوس)ی پاشای (لیدیا) بەدیل دەگرن، خۆی و چواردە لاوی لەگەڵ دەبەن، بۆ ئەوەی بیانخەنە ئاگرێکی گەورەوە، بەڵام دەڵێن لەم کاتەدا (کۆرش)ی پاشای فارس، دڵی پێیان سووتاوە و لەکاتی نزیك بوونەوەیاندا لە ئاگرەکە، فەرمانی دەرکردووە ئاویان پیدابکرێ، تا نەسووتێن... دەشێ ئەم گێڕانەوە بۆ فارسەکان، کەمێك ناتەواوی تیدابێ، چونکە فارسەکان ئاگریان زۆر لاپیرۆز بووەو ئەوەندە ئاگریان بەلاوە بەرزو پیرۆز بووە، پێیان نەنگ و گلاو بووە، خەڵکی دیل و ئاژەڵ و شتی پیسی تێ فرێ بدەن، لاشیان وابووە، ئەگەر لەماڵێکدا کەسێکیان، یان

ئاژەڵێکیان لە ماڵدا مردو ئاگر لە نزیك و لە ماڵەکەیدا هەبێ، دەبی ئیتر تا (٩) نۆ رۆژ ئاگر لەو ماڵەدا نەکرێتەوە (ئەگەر زستان بووایە)، تا مانگێك ئاگر لە ماڵیدا نەدەکرایەوە، دوای ئەم سزایەش ئەگەر تەمێ نەبووایە، دەکوژرا.. کەواتە سووتاندنی تەرم، لە ئاگردا، لای ئەوان بە گەورەترین شتی ناشیرین و گوناحکردن دانراوە، ئەمەیان بەکاری (ئەهریمەن ـ ئیبیس) زانیوە..

ئەم نەرێتە هەتا سەرەتاکانی چەرخی زایینیش هەر پەیڕەو دەکرا، ئا ئەو سەردەمەش هەر کەسێ شتێکی پیس، یان ئاژەڵێکی تۆپیو، یان تەپاڵە و ئەم بابەتانەیان فڕێ بدایەتە ناو ئاگرەوە، یان فووی لە ئاگر بکردایە، بە مەبەستی کوژاندنەوەی، لە سێدارە دەدرا!.

سەرگورشتەیەکیتریش بۆ بەسەرهاتی (کۆرش) و (ئەکرۆیشوس) هەیە، لەوەی سەرەوە زیاتر راسترەو رێی زیاتر تێدەچێ، کە (باکیلایدیس)ی شاعیری یۆنانی و هونەرمەندێکی تر، دەیگێڕنەوە. هونەرمەندەکە، وێنەی بەسەرهاتەکەی لەسەر گۆزەیەکی گڵێن وێنە کێشاوە، شاعیرەکەش (٤٠) چل ساڵ، دوای رووداوەکە، هاتۆتە دنیاوە، شاعیرەکە دەڵێ: کاتێ فارسەکان شاری (ساردیس)یان داگیرکرد، پاشا و سەرکردەکانی یۆنان، بڕوایان بە کۆیلەیەتی و ژێر دەستەیی نەدەکرد، بۆیە پێش ئەوەی دەستگیر بکرێن، خۆیان، ئاگریان کردۆتەوەو خۆیان تیدا سووتاندووە، هونەرمەندەکەش هەروەك شاعیرەکە دەیگێڕێتەوە، وێنەی پاشای کێشاوە، زۆر بە لووت بەرزو ویقارەوە بە چوار مشقی دانیشتووە. وەك چووبێتە خەڵوەتێکی پیرۆزی ئایینییەوە، چەپکێ گوڵی لەسەر ناوەو دارێکیشی بەدەستەوە گرتووە...

هەر لەم بابەتە دەگێڕنەوە کە (سەمیرامیس)یش، شاژنە بە ناوبانگەکەی ئاشوور، ئەسپێکی هەبووە، ئەوەندەی خۆشویستووە، کاتێ ئەسپەکەی مردووە، لە داخی ئەسپەکە، خۆی سووتاندووە..

(دیدۆ)ی شاژنیس، وەك ئەم، لە پێناوی (ئینیاس)ی دلداریدا خۆی سووتاندووە. کەواتە ئەم رووداوانە ئەوە دەگەیەنن، کە زۆربەی شاژن و پاشاو

سەردارانی ڕۆژهەڵات، بارێکی تایبەتی هاتۆتە ڕێیان، کە شایانی ئەوە بووبێ، خۆیانی بۆ بسووتێنن. بەپێی بیرکردنەوەو باوەڕی خۆیان...

ئەم خۆ سووتاندنە لەناو بێوەژنەکانی هیندستانیشدا، شتێکی زۆر باو و پێڕەو کرابوو، کە دوای مەرگی مێردەکانیان، خۆیان دەسووتاند. تا ئەم سەردەمانەی دواییش، بەتایبەتی تا ئینگلیز داگیری کردن.

لە ئۆرشەلیم - یش یادگاری خۆ سووتاندنی پاشاکانیان، تا سەردەمی (ئەشعیا) پێغەمبەر، هەر هەبووە، چونکە هەر ئەم پێغەمبەرە بووە وتوویەتی: (ئاگردانە مەزنەکە، لە دەمێکەوە هەیە، بەڵێ. هەر بۆ پاشا سازکراوە، پاشا خۆی ئەم ئاگردانەی گەورەو بەرین دروست کردووە، دار و تەختەی زۆری لەسەر کۆکردۆتەوە، هەناسەکانی خواوەندیش وەك لافاوی کبریت، هەڵیدەگیرسێنن). ئەو بەڵگانەی دوای ئەمانەش ماون، ئەوە دەسەڵمێنن، کە هەموو پاشاکانی جوولەکە، کە (٢٠٠) پاشا بوون، خۆیان سووتاندووە. تەنانەت (گەل)یش زۆربەیان منداڵەکانی خۆیان، وەك قوربانی بۆ خواوەند، سووتاندووە..

کەواتە پووختەی خۆسووتاندنی پاشاکانی ڕۆژهەڵات، ئەگەر ساتەکە گەیشتبێتە ئەوەی کە پێویست بکات خۆیان بسووتێنن، بەتایبەتی ئەو کاتانەی لە شەڕدا، لەوە نزیك بوونەتەوە بگیرێن، یان دەسگیر بکرێن و بە کۆیلەیەتی بهێلرێنەوە، واتە: ئەگەر خۆ سووتاندنەکە، بۆ ئەوە بووبێ، کە نەکەونە دەست دوژمن، لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە: خۆ، ڕێگای تر هەیە بۆ خۆ ڕزگارکردن، کە لەوانەیە لەم ڕێگایە، ئاسانتر و بێ ئازارتریش بێ، بەڵام لە وەڵامدا دەوترێ: ئەنجام ئەوە دەگەیەنێ کە هەڵبژاردنی چارەنووس و مردن، بەخۆ سووتاندن، وەك قوربانییەکی پیرۆز و وەك هەڵبژاردنی جۆرە (نەمری) یەك دەگەیەنێ، کە دوای خۆیان بەجێیانهێشتووە، چونکە (هملقار و هەرکولێ) هەردووکیان دوای خۆ سووتاندنیش، پەرستراون.

بێجگە لە ئەمانەش، هەر پێشینان بڕوایان وایە کە ئاگر، پاککەرەوەیەکی گەورەیە ئەگەر بتوانرێ بە چاکی بەکاربهێنرێ.. لەو بڕوایەوە کە ئەنجامی ژیان، هەر تەواو بوونە و مرۆڤیش دوای مردنی، جگە لە ڕۆحی، پێویستە هیچی لە پاش

بەجێنەمێنیٚ. ئەمە بڕوایەکە لەوپەڕی میتافیزیکەوە خۆی دەنوێنیٚ، کە ئاگر دڵسۆزترین هاوڕیٚ و دۆستی رۆحە و رۆحیش هەر بە نزیکبوونەوەو دۆستایەتی کردن لەگەڵ ئاگردا، بە پاکی و پیرۆزی دەمێنێتەوە، ئیتر گۆشت و ئێسقان و هەرچی (مادە) هەیە، هەمووی پیسە و دەبیٚ بەخۆڵەمێش و لەناو دەچیٚ، تەنیا رۆح نەبیٚ، کە هەر دەمێنی و بە نەمری دەژی و دەژی.. ئیتر دوای ئەمە هەموو شتێکیتری ئەم سەرزەمینە، پڕە لە رۆحی ئەو، ئاو، هەوا، خۆراك، خاك، هەمووی هەر رۆحی خواوەندە..

## ٨ـ خواوەندی بوومەلەرزە:

لە (فیلادلفیا) خەڵکی نوێژ بۆ (سایدۆت)ی خواوەندی بوومەلەرزە دەکەن، چونکە ئەم شارە لە بوولەمەرزەی زۆر و گەورەدا بەناوبانگە، لە (سانتورین)ی یۆنانیش هەمان دەستوور باوە، لەبەرئەوەی ئەمانیش تا ئێستا شوێنەکەیان پڕە لەکێوی ئاگرپڕژێن، گوایە خواوەندی (بۆسایدون) دڵ نەرمە و ئەگەر نوێژی بۆ بکریٚ، لە بوومەلەرزە دەیانپارێزیٚ.. هەندیٚ جێگای تریش کە ناوچەکانیان شاخاوییە، ئەوانیش هەر بۆ ئەوەی دڵی (بۆ سایدون) رازی بکەن و ماڵەکانیان بەسەردا نەڕوخێنیٚ، نوێژ و پەیکەری بۆ دەکەن..

هەر لە یۆنان، دەگێڕینەوە، جارێکیان سووپای (ئەسپارت)، لەو کاتەدا کە چۆتە مەیدانی شەڕ، بوومەلەرزەیەك روویداوەو زەوی لەژێر پێیاندا لەریوەتەوە. کوت و پڕ لە ترسدا دەستیان بە وێرد خوێندن و پاڕانەوە بۆ (بۆسایدۆن) کردووە، ئیتر دوای تاوێك هەموو سوپا، بەدەنگەوە وێردیان خوێندووە. لایان وابووە بەمە خواوەند دڵی نەرم دەبیٚ و هێمن دەبێتەوە..

ئەم نەریتە تا ئێستا لەناو هەندیٚ نەتەوەی (بەربەری)دا ماوەتەوە. چونکە تا ئێستاش خەڵکی (تیمور) لە دورگەکانی رۆژهەڵاتی هیندستان، دەڵێن گوایە زەوی، لەسەر شانی خواوەندێکی زۆر گەورە و زەبەللاحە، ئەم خواوەندە کاتیٚ شانێکی ماندوو دەبیٚ، دەیەوێت زەوی بخاتە سەر شانەکەی تری، ئا لەم ئاڵوگۆڕەدا، زەوی دەلەرێتەوە، بۆیە لەم کاتانەدا دانیشتووانی ئەم ناوچانە هاوار

بۆ خواوەند دەکەن، کە هێشتا زەوی هێمن و لەسەرخۆیە.. ئەگینا ئەگەر بڵێن (خوایە زەوی مەلەرێنەوە)، ئەوسا لەتاو داخی ماندوویەتی خۆی، زەوی فڕێ دەداتە زەریاوە..

لای هەندێ لە هۆزەکانی (کۆینبو)ی هیندییە سوورەکانیش، کە لە گوێ رووباری (ئۆکاو بالی) دەژین، پێیانوایە بوومەلەرزە هی ئەوەیە کە خواوەند لەم کاتانەدا، بۆ دڵنیایی لەوەی بزانێت دەستکردەکانی سەرزەمینی، ماون یان نا، جاروبار سەریان لێدەدات، لەم سەردانانەدا بوومەلەرزە دروست دەبێ، بۆیە کە بوومەلەرزە روودەدات، ئەم هۆزانە لەماڵەکانی خۆیان دەردەپەڕن و هاوار دەکەن: (بەڵێ، بەڵێ ئێمە هەین و دەژین)، بەو مەبەستەی کە دڵنیای بکەن و هێمن بێتەوەو بگەڕێتەوە بۆ جێگاکەی خۆی لە قووڵایی ئاسماندا.

لە ئەفەریقاش هۆزی (ئاتونگا)ی گوێ رووباری (نیاسا)، لایان وایە بوومەلەرزە، نرکە و دەنگی ئەو پرسیارەی خواوەندە، کە ئاخۆ دەستکردەکانی ماون یان نا؟ ئەمانیش کە هەست دەکەن بوومەلەرزەیە، هاوار دەکەن: (بەڵێ، بەڵێ ماوین) بڕواشیان وایە ئەم نرکەیە هەر کەس وەڵامی نەداتەوە، دەم و دەست دەمرێ..

لە هەندێ ناوچەی (سلیبیس)یش، کە بوومەلەرزە روودەدات، هەموو دانیشتووان دەکەونە رنینەوەی گیای سەر زەوی و ونجڕ و نجڕی دەکەن! بەمە دەیانەوێ بڵێن: قژی زەوی دەڕنینەوە، زەویش ئازاری دەگات، ئەوسا زەوی هەست دەکات خەڵك لەسەر زەون هەن، ئیتر دادەمرکێتەوە.. چونکە ئەمان وادەزانن بوومەلەرزە هێزێك دروستی دەکات، هەر لەناو زەوی خۆیدایەتی...

دانیشتووانی دورگەی (ساموا)ش هەمان بڕوایان هەیە، بەڵام ئەمان لەجیاتی رنینەوەی گیا، خۆیان لەسەر دەم بە زەویدا دەدەن و بە هەموو هێزیان گاز لە زەوی دەگرن و هاوار لە خواوەندی (ماخووی) دەکەن کە هێمن بێتەوەو دنیا تێکنەدات.

لە وردە دورگەکانی (فیلیپین)یش. هۆزەکانی (باگۆبۆ) بڕوایان وایە زەوی لەسەر ئەستوونێکی گەورەیە، بەڵام چەند هەژدیهایەکی گەورە، دەیانەوێ دای

بگرن، ئینجا ئەگەر هەژدیهاکان ئەستوونەکە بجوولێنن، ئەوا زەوی دەلەرێتەوە، ئەوسا ئیتر خەڵکی ئەم دوورگانە لە سەگەکانیان دەدەن بۆ ئەوی بوەڕن، چونکە (مار) لە وەڕینی سەگ دەترسیٚ و لە ئەستوونەکە دووردەکەونەوە..

بەڵام لە (ئاشاتیٚ) دوای هەموو بوومەلەرزەیەك، کۆڕێکی گەورە دەگرن. لەم کۆڕەدا چەند کەسیٚ لە سێدارە دەدەن، وەك قوربانی بۆ خواوەند، بە خوێنەکەشیان ئاوەڕشێنی ئەو ماڵە رووخاوانە دەکەن، کە بوومەلەرزە تێکی داون... دوای ئەم ئاوەڕشێنە، خانووەکان دروست دەکەنەوە... دەڵێن جارێکیشیان لایەك لە کۆشکەکەی پاشای (کۆماسی) بەهۆی بوومەلەرزەوە رووخاوە، قوربانییەکەی (٥٠) کوڕ و کچی لاویان سەر بڕیوەو خوێنەکەیان بەسەر کێوی (طین)دا رژاندووە.. بە پێچەوانەوە خەڵکی (تیاس) وا دەزانن بوومەلەرزە لەلایەن (باتو بنادو)ی بە دەوە روو دەدات.. ئەم خواوەندە بەدە حەز بە ئازاردانی خەڵك دەکات... ئەمانیش کە بوومەلەرزە روودەدات و زەوی دەقڵیشێتەوە، لە ناچاریدا هەرچی شك دەبەن وەك قوربانی، دەیخەنە ئەو دەرز و قڵیشانەی زەوییەوە و بەو نیازەوە لەو خواوەندە دەپاڕێنەوە کە دەست بەرداریان بێت.. بێجگە لە ئەمەش لە لقی درەختێك، پەیکەرێك دروست دەکەن و سوێند بۆ ئەو پەیکەرە دەخۆن کە ئیتر لەمەودوا دڵپاك و رەوشت چاك بن.

وەك وتمان لە یۆنان (بۆ سایدۆن)، بە خواوەندی بوومەلەرزەی دەزانن، لە هەمانکاتیشدا بەخواوەندی (زەریا)شی دەزانن، چونکە بەو پێیەی ئەم ناوچەیە کەوتۆتە سەر زەریا، هەمیشە شەپۆلی ترسناك و سامناك و زیانبەخشی لەسەرە. لەبەر ئەمە، (بۆ سایدون) خواوەندی زەریاشە. بەتایبەتی هەندێجار ئەم شەپۆلانە. وەك کێوێکی زەبەللاح، هەرەس بێنیٚ، ئاوا زەریا بەسەریاندا شەپۆڵ دێنیٚ و زیانی زۆریان لیدەدات.. لەم رووەوە روویداوە، زەریاش ئەوەندەی بوومەلەرزە، زیانی لێداون.

## ٩- پەرستنی دووکەڵی ژەهراوی و کانیاوی گەرم:

هەندێ ناوچە، بەپێی سروشتەکەی کانیاوی گەرمی مەعدەنیی تیدایە و هەڵمی لێ بەرزدەبێتەوە، بەتایبەتی لەو شوێنانەدا کە کێوی ئاگرینی تیدایە.. ئەم دیاردەیە زۆرە، بەڵام پێشنیانی یۆنانی کۆن، کە هەڵمیان دیوە لە زەوی هەڵدەقولێ، وتوویانە: ئەمە هەڵمی ژوورەکانی دۆزەخە، یان هەڵمی ژوورەکانی (بلوتو)یە. یان هەڵمی خواوەندی دۆزەخە. هەر ئەم دیاردەیە لە (ئیتاڵیا) پێیان وتووە: خواوەندی (ئەمسانکتس)ی بەناوبانگ، هەردوولاشیان لایان وابووە هەر کەسێ پێ بنێتە سەر ئەو هەڵمە. یەکسەر دەمرێ.. لەوانەشە هەر ئەم دیاردەیە بێ، وای لە شاری (هیراپولیس) کردبێ، بەناوبانگ و پیرۆز بێ، چونکە ئەم شارە پڕە لە کانیاوی گەرم و هەڵمی زۆری لێ بەرز دەبێتەوە..

لە (سوریا)ش تا ئێستا ئافرەتانی نەزۆك، لایان وایە کانیاوە گەرمەکان، پیاو چاك و وەلین. بۆیە زیارەتی ئەو کانیاوە گەرمانە دەکەن، کە کەوتوونەتە رۆژهەڵاتی زەریای (**المیَتّ**)ەوە، بە نیازی ئەوەی سکیان پڕ بکەن. کە دێنە سەر ئەم کانیاوانەش، قوربانیی بەرخ و بەران سەردەبڕن و خوێنەکەی دەکەنە ئاوەکەوە..

دەگێڕنەوە کە (هیرۆدۆتس)یش تووشی نەخۆشییەکی کوشندەبوو، جوولەکەکان لەم کانیاوانەیان هەڵکێشا، تا چاك ببێتەوە، بەڵام چاك نەبۆوەو کە گەڕایەوە (ئەریما) مرد.

خەڵکی ئەم ناوچەیە بەم کانیاوانە دەڵێن: (کانیاوی سلێمان)، چونکە وەك لە رابووردوودا گێڕدراوەتەوە، ئەم کانیاوانە، کاتی خۆی ئەو دروستی کردوون، تا مەلەیان تێدا بکات، فەرمانیشی بە خەڵکەکە کردووە، کە نەیەڵن ئاگر لەم کانیاوانە دوور بکەوێتەوە، تا هەمیشە گەرم بن.. تا ئێستاش ئەوانەی مەلە لەم کانیاوانەدا دەکەن، ئەگەر ئاوەکە ساردبێ، بانگی حەزرەتی سلێمان دەکەن و

دەڵێن: (هۆ، حەزرەتی سلێمان! داری تەڕ و وشك بخەرە ژێر ئەم کانیاوانەوە با گەرم بن) ئیتر لایانوایە دوای تاوێك ئاوەکە گەرم دەبێ...

ئەوەشی کە نەخۆشە و بۆ چاکبوونەوە دێتە ئەم جێگایانە، باسی جۆر و جێگای نەخۆشییەکانیان بۆ زێوانی ئەم کانیاوانە دەکەن، بۆ ئەوەی لای (سلێمان) بۆیان بپارێتەوەو کانیاوەکان گەرم بکات و چاکیان بکاتەوە.

تۆ بڵێی ئەم نەریت و باوەڕانەی پێشینان، سەبارەت بەم کانیاوانە، نهێنییەکی تێدا نەبێ، بەوەی کە ئێستا، پزیشکەکان کەڵکی زۆر، بۆ چاکبوونەوەی هەندێ نەخۆشیی لەم کانیاوە، مەعدنیانە وەردەگرن؟!.

## ١٠- چۆنێتی یاد و ئاهەنگی ئەدۆنیس:

لەو جەژنانەدا، کە لە رۆژئاوای ئاسیای بچووك و یۆناندا، بۆ ئەدۆنیس دەکرا، هەموو ساڵێك لە وەرزی بەهار، یان هاویندا، خەڵکی لە ئاهەنگێکی گەورەو زۆردا کۆدەبوونەوەو پەیکەری ئەدۆنیسیان لە ناوەڕاستی ئاهەنگەکەدا دادەنا، بەجۆرێك دایان دەنا، کە خەریکن بۆ کفن و دفن کردن ئامادەی دەکەن.. لەسەر پەیکەرەکەش لە خۆیان دەدا و خۆیان دەڕنی.. دوایی، زۆر بەڕێزەوە دەیانخستە زەریاوە و دەیاندایە دەست شەپۆل...

لە (ئەسکەندەریە)ش پەیکەری (ئەفرۆدیت)یان لە پاڵ پەیکەری ئەدۆنیسدا دادەنا.. هەرچی میوە و سەوزەی جوانیش بوو، بە دەورویپشتیاندا بڵاویان دەکردنەوە، پەرژینێکی جوانیشیان لە لق و پۆپی درەختی جوان بۆ دەڕازاندەوە، لای ئەمان، رۆژی یەکەمی ئاهەنگەکەیان بە ئاهەنگ و زەماوەندی بەیەکگەیشتن دادەنا و لەیەك مارەکردنی ئەو دوو دڵدارە.. بەڵام رۆژی دووەم، ژنانی وڵات قژیان بەر دەدایەوەو سنگ و بەرۆکیان رووت دەکرد و بە بەرگی رەشی (پرسە)وە، تەرم و پەیکەری ئەدۆنیسیان هەڵدەگرت و رووەو زەریا لەسەرخۆ دەڕۆیشتن... بەڵام رۆیشتنێکی پڕ هیوا. چونکە لایان وابوو جارێکی تر زیندوو دەبێتەوە...

لە (بیبیلۆس)یشدا، خەڵك بە شیوەن و رۆ رۆ و سنگ کوتان و لە خۆدان و شمشاڵ ژەندن، لە پەرستگای (عەشتار) گرد دەبوونەوە، چاوەڕێی

زیندووبوونەوەی ئەدۆنیسیان دەکرد، کە زیندووش دەبۆوە، جارێکی تر بە بەرچاویانەوە، بۆ ناو قوڵایی ئاسمان سەر دەکەوێتەوە، ئیتر دوای سەرکەوتنەوەی بۆ ئاسمان، پیاوانیان سەریان پاك پاك دەتاشن و خەمبار و دڵگیر دەبن بۆی.. ژنانیشیان، ئەگەر قژ و پرچیان وەك قوربانی بۆ نەبڕیایە، دەبووایە لە ڕۆژی جەژندا، لە ناو پەرستگای عەشتاردا، لەگەڵ خەڵکی نامۆدا دەست تێکەڵ بکەن و پارەو دەستکەوتی ئەم کارەش بۆ پۆشتە و پەرداخکردنەوەی پەرستگای عەشتار سەرف بکەن...

بەڵام لای (فینیق)ییەکان، جەژنی ئەدۆنیس لە بەهارا بووە، ئەوکاتەی جۆگە و چەم و ڕووبارەکان. سووراوی ئەو شاخ و بنارانە، لەگەڵ خۆیان دێننە خوارەوە و ڕەنگی ئاو، وەك ڕەنگی خوێن سوور دەبێت[1]، بەمە لایان وابووە ئەم ڕەنگە سوورە، خوێنی ئەدۆنیسە. چونکە هەموو ساڵێك لەسەر چیایەکی بەرزی لبنان، بەرازێکی کێوی دەیکوژێ، بۆیە لە وەرزی بەهاردا هەر گوڵێ ڕەنگی سوور بێ، دەڵێن: ئەمە خوێنی ئەدۆنیسە، بەتایبەتی (گوڵاڵە سوورە ـ شقائق النعمان)، لەبەرئەوەی وشەی (نعمان) بە مانای دڵدار و خۆشەویست دێت، (شقائق)یش بە مانای (زام) دێت، کە بە هەمووی (زامی دڵدار، یان زامی خۆشەویست) ئەگەیەنێ..

جگە لەمەش دەگێڕنەوە کاتی خۆی کە ئەفرۆدێت بە هانای زامی ئەدۆنیسەوە چووە، پێی بە درەختێکدا ناوە، گوڵی سپی گرتووە، بەڵام دڕکەکانی ئەو درەختە لە پێی چەقیون و پێیان زامدار کردووە، ئیتر ئەو گوڵە سپیانە بۆ هەتا هەتایی بەو خوێنە ڕەنگیان سوور بووە..

ئەمانە و پێشتر وتمان لە هەموو ئەم ئەفسانانەدا باوەڕ وابووە کە یەکێك دەمرێت پاش مردنی، ڕۆحەکەی هەر دەمێنێ و ڕۆژێك هەر دەچێتەوە گیانی یەکێکیتر و لە دایك دەبێتەوە.. لەبەرئەوە هەموو گوڵێکی سووریان بە ڕۆحی مردوویەکی ڕابووردوو زانیوە و لە هەر جێگایەکدا شەڕێکی وابووبێ، کوشتاری تێدا ڕووی دابێ، ساڵی داهاتوو، کە گوڵ لەو ناوچەیەدا ڕوواوە، ووتوویانە: خوێنی

---

(١) لە کوردەواریدا بەم وەرزی ئاوهەڵسان و جۆری باران و لافاوە دەڵێن: ئەرخەوان سوور.

کوژراوان و شەهیدانە. کەواتە ئاهەنگی ژیانەوەی ئەدۆنیس، لە هەمانکاتدا ئاهەنگی ژیانەوەی مرۆڤ و سروشت و زەوییە.

ئەم مردن و ژیانەوەیەی ئەدۆنیس، لە وەرزی ژیانەوەی سروشتدا، دیاردەیەکە زۆر پێوەندییەکی پتەویان لەگەڵ یەکدا هەیە... سەبارەت بەم پێوەندییە، چەند جۆرێکی لێ دەگێڕنەوە، جۆرێك دەڵێن: گوایە ئەدۆنیس، لە درەخت بووە، واتە دایکی درەخت بووە، درەختێك ناوی (قاڵ ـ المر) بووە، ئەم درەختە ئەو درەختەیە کە (بخوور)ی لێ دروست دەکرێ، ئەم دایکە یا ئەم درەختە بە (١٠) دە مانگی ئەدۆنیسی بووە.. لەوانەشە بەکارهێنان و سووتاندنی (بخوور) لە ئاهەنگی ژیانەوەی ئەدۆنیسدا بگەڕێننەوە بۆ ئەوەی کە دایکی ئەدۆنیس درەخت بووە. یان ئەدۆنیس خۆی پێوەندییەکی لەگەڵ رووەك و درەختدا هەبووبێ.. ئەم پێوەندییە لە ئاهەنگەکانی بابل و جوولەکە لە پەرستگەکانیشدا، کە بۆ کچە خواوەندی ئاسمانیان گێڕاوە، هەر هەبووە و کچە ئاسمان لە ناوەڕۆکدا هەر مەبەستی لە عەشتارە.. چونکە ئەوانیش لە ئاهەنگەکانیاندا بخووریان بەکارهێناوە.

بێجگە لە ئەمەش دەڵێن ئەدۆنیس، لە چوار بەش، سێ بەشی تەمەنی ساڵانەی لە جیهانی خوارووی زەویدا بەسەر بردووە، بەشەکەیتریشی لە ئاسمان...

شیتەڵکردنەوەی ئەم سەرگورشتەیەیان ئاسانە، چونکە ئەگەر وابێ، ئەوا مەسەلەکە هەر ئەوەندەی تەمەنی (رووەك)ە، کە تەنیا وەرزێك لە جیهانی دەرەوەی سەر زەویدا دەژی، بەتایبەتی (گەنم)، کە نزیکەی (٦) شەش مانگێك زیاتر لەژێر زەویدا دەمێنێتەوە..

بەڵگەیتر بۆ ژیانەوەی (ئەدۆنیس) لە وەرزی (رووەك)دا نزیکتر و شیاوتر بەدەستەوە نییە، تا مەسەلەی ژیانەوەکەی لەگەڵدا بەراورد بکرێ... کەواتە بەمەدا دەتوانین بڵێین: رەمزی ئەدۆنیس و تەموز، لە کاکڵەدا مەبەست لەوەیە بووترێ ئەم دووانە، کە هەردووکیان یەك شتن، رۆحی (دانەوێڵە)ن. بەتایبەتی وەك نووسەرێکی کۆنی عەرەب دەیگێڕێتەوە ئاهەنگی تەمووز، لە ناوەڕاستی مانگی تەمووزدا لە ناوچەکانی (سووریا) و (حەڕان) کراوە، ئەم نووسەرە

کوتومت، ئەو نەریتە و شێوەی ئاهەنگە دەگێڕێتەوە، کە پێشتر وتمان ئەو نەریت و شێوەیەی لە ئاهەنگەکەدا ژنان خۆیان رنیوەو شیوەن و گریانی زۆریان لەسەر کردووە، لەوانەشە شیوەن کردن لەسەر ئەدۆنیس هەتا رادەیەك پەشیمانیشی تێدابێ، سەبارەت بەوەی مرۆڤ خۆی ئەو رووەکە لەناو دەبات، بەوەی دەیدات بە مەڕ و مالاّت، یا وەك میوەو بەری درەخت خواردوویەتی و لە کاروانی و هاتوچۆشدا پێی پێدا دەنێ.. دوای ئەمانەش لەکاتی (درەو)دا، لەناویبردووە، چونکە لەکاتی دەرودا گوڵەگەنم کەوتۆتە ژێر پێی وڵاخ و دواییش (گێرە)ی لەسەر کراوە، دوای گێرەش بۆ ئاش براوە بۆ هاڕین.. ئەوەی ئەم لایەنەیان زیاتر دەسەلمێنێ ئەوەیە کە لەکاتی شیوەنکردندا بۆ ئەدۆنیس، هیچ شتێکی هاڕڕاو ناخۆن، چونکە لەو وەرزەدا گوڵەگەنم دەهاڕدرێ.. جگە لەم پێوەندییانەش، بەستنەوەو پێوەندی ئەدۆنیس لەگەڵ وەرزی ژیانەوەی رووەکدا ئەنجامێکیتریش بەدەستەوە دەدات، ئەویش مەسەلەی پێشکەوتن و هەنگاوهەڵهێنانی مرۆڤە لە قۆناغی کۆچەرێتی و رەوەندێتی و شوانکارییەوە بۆ قۆناغی کشتوکاڵ و نیشتەجێبوون، کە ئیتر مرۆڤ دابین بووە، بێگومان مرۆڤی پێشینان زوو هەستیان بە گرنگێتی ئەم هەنگاوە کردووەو بە سەرکەوتنێکی گەورەیان زانیوە، چونکە مرۆڤ رۆژ دوای رۆژ بەدەم کشتوکاڵەوە بەرهەمی تازەتری کشتوکاڵ فێربووە. بۆیە ئەم ئاهەنگە مەزنەیان بۆ خواوەندی پیت و دانەوێڵە گێڕاوە، تا زیاتر دەستگیرۆیی و یارمەتی و پستیوانیان بکات، کەواتە نەرێتەکە خۆی لە خۆیدا مانای تێر بوون و برسێتییە..

ئالێرەوە دەتوانین بڵێین: شتێکی ئاساییە بۆ وەرزی بەهار و هاوین، ئاهەنگ بگێڕن و بۆ کۆچیشیان شیوەن بکەن، تا رۆحی ئەدۆبیسی خواوەند رازی بکەن.

بەڵام لە (ئەسینا) ئاهەنگی ئەدۆنیسیان لە سەرەتای بەهار و بەتایبەتی لە ناوەڕاستی مانگی مارتدا گێڕاوە... ئەمانیش لایان وابووە لەگەڵ ژیانەوەی سروشتدا، مردووەکان گیانیان بە بەردا دێتەوە و زیندوو دەبنەوەو هەڵدەستنە سەر پێ، بەسەر شەقامەکاندا بەرەو پەرستگاکان بەرێ دەکەون..

سەبارەت بەم جەژنەی خەڵکی (ئەسینا) دەڵێن: لەم وەرزانەدا مردن، شتێکی ترسناك و سامناك نییە، کە بیەوێ خەڵك بکوژێ و ئازاری بدات. بەڵکو دەیەوێ خەوێکی شیرین و درێژخایەن لە خەڵك بخات و چێژی نووستنێکی گەورە، چێژی ئەندێشەیەکی پیرۆز، چێژی هێمن بوونەوە و پشوویەکی دڵنیایی بەسەرخەڵکدا، دابەش بکات، تا وەرزی ژیانەوەو سەرهەڵدانەوەی سروشت و مرۆڤ و خاك، کە مرۆڤ لە دوای زیندووبوونەوەی دەست بەسەر سروشتدا دەگرێ، ئەوەمان دەداتێ کە مرۆڤ لە ئەنجامدا خاوەن خواوەندی سروشت بێت، بە هەموو ئەو شتانەوە کە تیایدایەتی، بەتایبەتی بەروبوومی کشتوکاڵ و بەتایبەتیتریش لەمە، خاوەن و خواوەندی (گەنم)ە، چونکە هەر لەگەڵ پێڕەوکردنی ئەو ئاهەنگانەدا کە بۆ ژیانەوەی ئەدۆنیس دەکران، بێجگە لە ئەوانەی لە سەرەوە باسمانکردن، ژنانی ئەو جێگایانە، پێش ئاهەنگەکە، لەناو سوێنە و مەرکانەدا، هەندێ گەنمیان چاندووەو دوای ئەوەی چەکەرەی کردووە، رۆژانی ئاهەنگەکە، ئەو کاتەی تەرم و پەیکەری ئەدۆنیسیان بەرەو زەریا هەڵگرتووە، ئەم گەنمە روواوانەشیان لەگەڵ خۆیاندا بردووەو پێکەوە لەگەڵ فڕێدانی تەرمی ئەدۆنیسدا بۆ ناو زەریا، فڕێیانداوەتە زەریاوە..

ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە پێشینان پێیان وابووە بە رواندنی ئەو گەنمە، ئیتر لە داهاتوویەکی نزیکیشدا، گەنم دەڕوێ..! ئینجا ئەگەر ویستبێتیان هەر شتێك بەدەست بێنن، پێشتر ئەنجامەکەیان نواندووە، بۆ وێنە: کە ئاویان بەسەر بووکە بە بارانێدا رژاندووە، مانای وایە داوای ئاو دەکەن لە خواوەند و مەبەستیان باران بارینە.. یان کە ویستوویانە خۆر هەڵبێت، ئاگریان کردۆتەوە، هەر بەم جۆرەش، پێش ژیانەوەی سروشت، ئەمان لای خۆیانەوە، گەنمیان رواندووە! کە گەنمەکەشیان فڕێداوەتە ئاوەکەوە، مەبەستیان لە ئاوی باران بووە، کە بەسەریدا بباریّ و ژیانی بداتیّ.. تا ئێستاش لە گەلێ جێگای ئەوروپادا ئەوە باوە، کە لە هەندێ جەژن و ئاهەنگدا، پەیکەری مردووی پێشنیانیان فڕێبدەنە ئاوەوە، بەمەبەستی باران بارین، بەتایبەتی تا ئەمڕۆش خەڵکی (ئەڵمانیا و فرەنسا و ئینگلتەرا و ئیسکۆتلاندا) دوای هەموو (درەو)ێك، ئاو بەو جێگایەدا دەرێژن..

له (والاشیما و ترانسلڤانیا)ی رۆمانیی، ئەگەر کچێك له دوای رۆژانی درەو دا و له دوا (مەلۆ)ی گەنمەکە، چەپکێك، یان تاجێك له گوڵە گەنمی لەسەر بنایە، خێرا خەڵك بەرەو پیری رایان دەکردو ئاویان پێدا دەکرد، له گەڕانەوەشدا لەبەر دەرگای خۆیاندا دوو جووتیار له چاوەڕوانیدا دەوەستان، تا ئاوی پێدا بڕێژن... لاشیان وابوو ئەگەر ئاوی پێدا نەڕێژن، ئیتر بێ بارانیی روویان تێدەکات.

له (یۆبیا)ی سەرووش، کاتێ که شارای گەنم بارتەقا دەبێت، ژنێك مەسینەیەك ئاو دێنێ، جووتیاران لەسەر شارا گەنمەکە دەستی پێ دەشۆن.. به مەبەستی ئەوەی شارا گەنمەکە تەڕ ببێ، که دەستیان شت، ئینجا ژنە جووتیارەکە به مەسینەکەی دەستییەوە به دەوری شارا گەنمەکەدا رادەکات و بازنەیەکی گەورەتر له بازنەی شارا گەنمەکە دروست دەکات، بەدەم راکردنیشەوە له خواوەند دەپاڕێتەوە که ساڵی داهاتوو، بارتەقای شارا گەنمەکانیان گەورەتر بکات.

له (بروسیا) و (ئەنهلت) و (هس) و (نابورغ) و (باڤاریا)ش، که جووتیارەکان له دوای تۆو وەشاندن بۆماڵەوە دەگەڕانەوە، ژنەکانیان به پێکەنینەوە ئاویان به سەریاندا دەکرد، به جۆرێك که هەرچیان پێ بووایە تەڕ دەبوو، هەر له بێڵ و خاکەناز و چەك و وڵاخیشەوە... به گاڵتەوە ژنەکانیان دەگرت و دەیانخستنە ناو ئاوەوە، تا هەموو گیانیان تەڕ دەکردن.. بەڵام هیندییە سوورەکانی ئەفەریقا له (تۆسایان)، پێش ئەوەی جووتیارەکان بۆ تۆو وەشاندن بچوونایە، ژنەکانیان ئاویان پێدا دەکردن.. له (سانتاگۆ)ش هەر هیندییە سوورەکان، پێش ئەوەی تۆوەکە بوەشێنن، دەیان کردە ئاو.

هۆزەکانی (ئۆراون)یش له (بنگاڵ)، له وەرزی چاندنی برنجدا، دەستەیەك کوڕ و کچی لاویان دەچن لقێکی گەورەی درەختێك دەهێنن، به گۆرانی و خۆشی و تەپڵ لێدانەوە، له گۆڕەپانێکدا دەیچەقێنن، قوربانیشی بۆ سەر دەبڕن... بۆ رۆژی دوایی، کوڕان و کچان، ئەڵقە و ئەڵق دەست دەگرن و به دەوریا سەما دەکەن و گۆرانی دەڵێن.. لقی درەختەکەش به قرتێله و شتی رەنگاو رەنگ دەڕازێننەوە.. دەستەیەکیتر له کچان (لم) و زەغفەرانیان تێکەڵ کردووەو گەنمیان تێدا رواندووە. ئەم گەنمەیان له رۆژی ئاهەنگەکەدا هەڵکەندووە و له سەبەتەیەکدا له بەردەمی لقی درەختەکەدا

داناوه.. کچەکانیش خۆیان لەسەر دەم بە زەویدا داوە و زەوی چاك دەکەن و دەپاڕێنەوە.. پاشان لقە دارەکە فڕێ دەدەنە جۆگەو رووبارێکەوە. دیارە دانانی ئەو گەنمە، لەبەردەم لقە درەختەکەدا، خۆی لە خۆیدا مانای ئەوە دەگەیەنێ کە هەر درەختەکە خۆی رەمزی پیت و بەخشین و ژیاندنەوەیە.. فڕێدانە ئاویشی مانای داوای تەڕ بوون و ئاو و باران دەکەن...

لێرەوە دەتوانین بڵێین جیاوازیی نەریتی ئەدۆنیس لە (نیپال) و (گریك)دا، ئەوەیە رۆحی درەخت لای بەنگالییەکان بەشێوەی رەمزەکەی خۆی دەنوێنێ، کە وەك وتمان ئەدۆنیس نەوەی درەختە.. لای (گریك)ەکانیش مرۆڤە و لە شێوەی پەیکەردایە، بەڵام لە هەردوو شێوەکەدا کاکڵەکەی هەر پێوەندی بە ژیانەوەی سروشت و رووەکەوە هەیە.

هیندییەکانیش هەر لە وەرزی بەهاردا ئاهەنگ بۆ ئەدۆنیس دەگێڕن، بەتایبەتی لە ناوچەی (راجیوتانا). ئەوان بەم جەژنە دەڵێن: (گۆری) یان (ئایسانی)، ئەم جەژنەش راستەو راست بەرامبەر بە (نەورۆز) دەبێ، کە سەری ساڵی تازەی ئەوان دەگرێتەوە، ئەو کاتەی ناوچەکانیان سەراسەر دەبووژێتەوە..

بۆ ئەم ئاهەنگە پەیکەرێك بۆ (گۆری) و یەکێکیش بۆ (ئیسوارا)ی ژنی دەکەن، هەردووکیشیان پێکەوە دادەنێن، چاڵێکیش هەڵدەکەنن، گەنمی تێدا دەنێژن، ئەم گەنمە خۆیان گەرمای دەستکردی بۆ دروست دەکەن، تا زووتر پێ بگات، کە پێگەیشت ئیتر ئافرەتان دەکەونە گۆرانی و هەڵپەڕکێ و سەما، لە (گۆری)یش دەپاڕێنەوە کە ژیانەوە بە سروشت و مێردەکانیان ببەخشێت.. ئەم ئافرەتانە بۆ ئەم جەژنە، خۆیان بە جوانیرین شێوە دەڕازێننەوە، چەیکە گوڵە گەنم و گوڵی رەنگاو رەنگ، لە قژ و پەرچەم و سنگ و بەرۆکیان دەدەن.. ئەم ئاهەنگە چەند رۆژێك دەخایەنێ.. شەوانی ئاهەنگەکەش لە ماڵی خۆیاندا ئاهەنگ هەر بەردەوام دەبێ.. پەیکەرەکانی خواوەندیش دەڕازێننەوە.. دوا رۆژی ئاهەنگەکە پەیکەرەکان لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن و بەرەو زەریاچەیەکی جوان دەیبەن... لەوێ ئافرەتان بەدەم گۆرانی دلداری و وێرد و پاڕانەوەوە، پەیکەرەکان لەسەرخۆ

فڕێدەدەنە ناو ئاوی زەریاچەکەوە.. گوایە ئیتر ئەم خواوەندەش دەکەوێتە مەلەکردن و ئاهەنگگێڕان لەگەڵ خەڵکیدا.

بەڵام (براهمی)ییەکان لەم وەرزەدا چەند جۆرێك تۆو، تێکەڵ دەکەن و لە شوێنە تەڕەکاندا دەیاننێژن.. تازە بووك و تازە زاواکانیش تا ماوەی پێنج رۆژ، بەیانیان و ئێواران ئاویان دەدەن.. کە پێگەیشتن دەیانخەنە جۆگەلە، یان رووبارێکەوە.. لە ناوچەکانی سەرووی رۆژئاوای (هیمالا)ش، جووتیاران گەنم و جۆ و گەنمە شامی لە سەبەتە و قووڵینەدا دەنێژن، لە نێوان ئەم چڵانەدا، کە سەریان دەرهێناوە و چرۆیان کردووە، پەیکەری بچووك بچووکی خواوەندەکانی (مهاوبۆ) و (بارڤاتی) دادەنێن و دەیانپەرستن.. ئیتر کە هەموو ئەم تۆوانە سەوز بوون، دەیانقرتێنن و چەپك چەپك لە سنگ و بەرۆك و قژ و پەرچەمیان دەدەن..

ئەم جۆرە ئاهەنگانە هەر بەم شێوانە، یان هەندێ جیاوازتر لە گەلێك ناوچەی ئەوروپادا پێڕەو کراوە.. تا ئێستا لە (سردینیا) ئەم ئاهەنگە بە گەورەترین ئاهەنگ دەزانن، ئەوان پێیدەڵێن: جەژنی (ماریوحەننا)، کە لە سەرەتای مانگی نیساندایە و لە هەندێ جێگایتریش وەك (صقلیە)، لە مانگی حوزەیران و دواتردایە... ئەم جەژنی (مار یوحەننا)یە، بەپێی جێگاو ناوچەکانی ئەم دوو شوێنە، جۆری ئاهەنگگێڕانی جیاوازە، کە تێکڕای سیماو ناوەڕۆکی جەژنەکان سەرومڕ هەر لە جەژنی ئەدۆنیس دەچن. چونکە لە هەلادوولایاندا مەسەلەی ژیانەوەی سروشت، شتی سەرەکییە.. بۆ نموونە لە (بابل)دا کە جەژنی (تەمووز) دەکرا، لە ناوەڕاستی هاویندا دەکرا.. بۆ ئاهەنگەکەش پەیکەری (تەمووز) جوان جوان بەئاوی پاك دەشۆرا..

# شاعیری گەورەی عەرەب
# ((ئەدۆنیس))

(١)

تەرجەمەی شیعر، بە پێچەوانەی تەرجەمەی هونەرەکانی تری وەك چیرۆك و شانۆنامە و رۆمان و رەخنە و... هتد، لەو کارە دژوارانەیە، کە خودی گەوهەری شیعر، رقی لێیەتی... چونکە شیعر، بە هەر زمانێك لە دایك بێت، تایبەتمەندێتی ئەو زمانەی پێوەیە و، ئەو زمانەش تێکڕای واژەگەل و ئاهەنگ و ئاوازی ریتمی واژەکانی و رەوانبێژیی و داروپەردووی رستە سازیی زمانەکەی، لەگەڵ تایبەتمەندێتی زمانێکی تردا جیاوازە... بە واتایەکی راستتر: شیعر، رۆڵەیەکی جگەرسۆز و ئەمەکدار و حەڵاڵزادەی ئەو زمانەیە، کە پێی لە دایك بووە و فرچکی پێگرتووە و پێی خۆشە هەر بە رەسەنایەتی و تایبەتمەندێتی ئەو زمانەوە بژی و سەوز بێت... بۆیە وەك شاعیری گەورەمان (پیرەمێرد) دەڵێ: شیعری تەرجەمە کراو، وەك ئەوە وایە شمشاڵ، بەم سەرە و سەر بژەنرێت... هەروەها شاعیرێکی ئەمەریکایی، لە وەڵامی پرسیارێکدا، سەبارەت بە پێناسە کردنی شیعر، دەڵێ: شیعر، ئەو شتەیە، کە ئەگەر تەرجەمە بکرێ، ئیتر شیعر نییە... بەڵکو دەبێتە

شتێکی تر... یان وەك شاعیری ناسراوی فەلەستینی (مەحموود دەروێش) دەڵێ: شیعری تەرجەمە کراو، وەك ئەوە وایە کچێك لەو دیو شووشەیەکەوە ماچ بکەیت... یان شاعیرێکی تر دەڵێ: تەرجەمە کردنی شیعر، وەك ئەوە وایە بلبل ـ ێك لە پێناوی گۆشتەکەیدا بکوژیت... یان لە مانەش وردتر، قسە بڵاوەکەی شاعیری باڤاری (رەسووڵ حەمزەتۆف)ە، کە دەڵێ: شیعری تەرجەمە کراو، وەك گوڵی ئەودیوی فەرش وایە...

....ئیتر و ئیتر... بەڵام لە سەروو ئەمانەشەوە، ئەگەر تەرجەمە کردنەکە، لەگەڵ ئەو شیعرانەدا بێت، کە: یان کێش و سەروا (وەزن و قافیە) یان هەبێ... یان هاوئاهەنگی و یەکسانی، لە نێوان هەردوو لایەنە گرنگەکەی شیعردا: (شێوە و ناوەڕۆك)، رەچاو کرابێ (کە رەنگە لە زۆر لایەنی سەرکەوتوودا، گرنگیی بەلایەنی روخسار بدرێ) ئەوا لەم کاتانەدا، ئەگەر گەوهەری شیعر، بریتی بێت لە شێوە و ناوەڕۆك، ئەوە هەر تێکڕای روخسار (شێوە)ی شیعرەکە، واتە نیوەی کارە هونەرییەکە، یان نیوەی گیانە زیندووەکەی شیعر، دەکوژرێ... جگەلە کوشتنی چەندان لایەنی تری هونەری شیعرەکە... کوشتنی کێش و قافیە... کوشتنی... هتد، لە دەست دەچن.

کەچی لەگەڵ ئەمانەشدا، پەیامی گۆڕینەوەی جوانیی... پەیامی گۆڕینەوەی فەرهەنگی نێوان گەلان... پەیامی گۆڕینەوەی چێژی هونەری وستاتیك... ئەوە پێویست دەکات، تاقیکردنەوەی سەرکەوتووی گەلان، داهێنانی جوان، لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر، تەرجەمە بکرێن.... ئیتر ئەگەر لەم تەرجەمە کردنەشدا، لایەنە هونەرییەکانی شیعرەکە، ببنە قوربانی... دیسان دەڵێین: چارنییە و دەبێ تەرجەمە، هەر بکرێ....

**(٢)**

(ئەدۆنیس)، شاعیری گەورە و بە ناوبانگی ئەم سەردەمەی عەرەب، یەکێکە لەو شاعیرانەی، کە زۆر بە دژواریی، شیعرەکانی بۆ تەرجەمە، دەستەمۆ دەبن... چونکە شاعیرێکە لە ماوەی ئەم چل ساڵەی دوایی ژیانیدا، رچەی چەند تاقیکردنەوەیەکی هەمەجۆرە و تازەی شیعری شکاندووە و لە هەر جۆرە تاقیکردنەوەیەکیشدا، جۆرە تایبەتمەندێتی و سنعەتسازیی و داهێنانێکی دەگمەن و کەم وێنەی پێشکەش شیعری هاوچەرخی عەرەبی کردووە.... کە ئەم تاقیکردنەوە شیعرییانە (تا ئەو کاتەی من شوێن پێی هەواڵیم هەڵگرتووە)، لەساڵی ١٩٥٧ تا ساڵی ١٩٨٨ز ـ لە(١٠) دیوانی شیعرییدا دەرکەوتوون، کە ئەمانەن:

١ ـ قصائد اولی ـ یەکەمین چەپکە شیعر ١٩٥٧ز.

٢ ـ اوراق فی الریح ـ پەڕەکاغەز لە هەوادا ١٩٥٨ز.

٣ ـ اغانی مهیار الدمشقی ـ گۆرانییەکانی مهیاری دمشقی ١٩٦١ز.

٤ ـ کتاب التحولات و الهجره فی اقالیم اللیل و النهار ـ کتێبی گۆڕانکاریی و کۆچ، لە کیشوەرگەلی رۆژ و شەودا ١٩٦٥ز.

٥ ـ المسرح و المرایا ـ شانۆ و ئاوێنە ١٩٦٨ز.

٦ ـ هذا هو اسمی (وقت بین الرماد و الورد) ـ ئەمە ناوەکەمە (کاتێك لە نێوان خۆڵەمێش و گوڵ دا) ١٩٧١ز.

٧ ـ مفرد بصیغه الجمع ـ تاك بە شێوەی کۆمەڵ ١٩٧٥ز.

٨ المطابقات و الاوائل ـ هاو ئەندازەکان و سەرەتاکان ١٩٨٠ز.

٩ ـ کتاب الحصار ـ کتێبی ئابلۆقە ١٩٨٠ز.

١٠ ـ احتفاءً بالاشياء الغامضــه الواضحــه ـ به يادى شته ناديار و ئاشكراكانەوە ١٩٨٨ز*.

هەر يەكێك لەم ديوانە شيعرييانەش، لە سەردەمى چاپ و بڵاوبوونەوەياندا، كومەڵێك باس و خواسى فەرهەنگى و ئەدەبيبان بەدواى خۆياندا وروژاندووە و گۆمى رەخنەى شيعرى عەرەبييان شڵەقاندووە.... كە زۆر جار (ئەدۆنيس) خۆى، ناچار بووە، لە وەڵامى رەخنەگران و خوێندەوارانيدا، كە لە سەر لاپەڕەكانى رۆژنامە و گۆڤارى عەرەبييدا، بڵاويان دەكردەوە... بێتە دەنگ و لێكدانەوەى قووڵ، لەسەر بير و بۆ چوون و ديدى خۆى، لەبارەى شيعر و مەسەلەكانى روناكبيريى، دەربڕێ و بەمەش سەر لەنوێ رەخنە و لێكۆڵينەوە و مشتومڕى ترى ئەدەبيى، هاتۆتە گۆڕێ و وتار و لێكۆڵينەوەى هاوچەرخانەى زۆر تازە و بە كەڵك، بە ناو جەماوەرى شيعردا بتەنێتەوە... كە لەم بوارەدا (ئەدۆنيس) خۆى، بە يەكێك لە گەورە رەخنەگرانى شيعرى هاوچەرخى عەرەبى دادەنرێ و دكتۆرانامەكەيشى، كە لە كتێبێكى سێ بەرگيدايە، بە ناوى (الثابت و المتحول ـ نە گۆڕ و بگۆڕ)، توێژينەوەيەكى رەخنەسازييانەى زۆر قووڵ و فەلسەفييانە، لەبارەى كێشەكانى شيعر و فەلسەفە و ژيان و داهێنانى ئەدەبيى و روانينى رووناكبيرانە و شاعيرانە، بۆ شيعر و بوارەكانى رەخنە و روناكبيريى...

كەرەسە و خواستەمەنييەكانى شيعرى ئەدۆنيس، ئەوەندە سنعەسازيى و جێ پەنجە و مۆرك و تايبەتمەنديى (ئەدۆنيس) يان پێوەيە، كە شيعرى (ئەدۆنيس)ى لە شيعرى هاوڕێكانى پێش خۆى و ئەوانەى دواى خۆى جيا كردۆتەوە...

واتە شيعرى (ئەدۆنيس) لە چاو هاوڕێكانيدا، ئەوانەى لە هەڵتەكاندنى داروپەردووى شيعرى پێش خۆياندا كاريان كردووە، يەكجار جياواز و لەبەرچاوە... بە جۆرێك كە شيعرى (ئەدۆنيس)، بۆن و بەرامە و رێباز و هونەرێكى ئەدۆنيسانەى پێوەيە و دەتوانرێ بە قوتابخانەيەكى شيعريى ناوبرێ... چونكە تاقێكردنەوەى شيعرى (ئەدۆنيس)، زەبرى لە سەر

* لەكۆتايى ئەم وتارەدا بەرهەمەكانى ترى ئەدۆنيس بەرچاو دەخەين

تاقیکردنەوە و بەرهەمی شاعیرانی سەردەمی خۆی کردووە و ڕەنگی لە بەرهەمیاندا داوەتەوە...

هەرچەندە لێرەدا دەبێ ئەوە بوترێ، کە تاقیکردنەوە و تەمەنی شیعری (ئەدۆنیس)، لە چاو تاقیکردنەوە و تەمەنی شیعری ئەو دەستە شاعیرە عەرەبەدا، کە پێیان دەوترێ: ڕابەرانی نوێکاری شیعری عەرەبی، نزیکەی (١٠ ـ ١٥) سالێك درەنگترە... چونکە ئەگەر دەستە شاعیرەکەی پێش ئەدۆنیس، لە سەرەتای سالآنی (١٩٦٠ز) بە دواوە، تەقەللایان لە بواری نوێکردنەوەی کەرەسە و خواستەمەنییەکانی شیعری عەرەبیدا دابێ، ئەوا (ئەدۆنیس) لە ناوەڕاستی سالآنی (١٩٧٥ز)ەوە، بەدواوەیە...

ئەو پۆلە شاعیرە عەرەبەش، کە وتمان پێیان دەوترێ: ڕابەرانی نوێکاری شیعری عەرەبی، بەڕێکەوت و بە جوگرافیا، هەموویان خەڵکی عێراقن، کە بریتین لە: (بدر شاكر السيّاب ـ ١٩٦٣ز کۆچی دوایی کردووە)، (نازك الملائكە ئافرەتە و هێشتا لە ژیاندایە[1])، (عبدالوهاب البياتي ـ هێشتا لە ژیاندایە).. و لەگەڵ هەندێ ناوی تردا، کە لە وڵاتانی تری عەرەبدان و جێگە و خانەی تایبەتییان لە نوێسازی شیعری عەرەبیدا هەیە، وەك (صلاح عبدالصبور ـ لە میسر) و، (نزار قباني ـ سوريا) و... ئەم چەند ناوە دیار و درەوشاوەیەش، سەرەڕای ئەوەی کە هەر یەکەیان خاوەنی دەنگێگی تایبەتی خۆیانن و بە دەسەڵاتێکی شاعیرانەی زۆر زیرەك و هونەرمەندانەوە، جێگەی خۆیان لە نەخشەی شیعری عەرەبیدا کردۆتەوە.. بەڵام ناوی (ئەدۆنیس)، لەو ناوانەیە، کە ئەگەر لەم لیستەی نویسازییەدا، بێینە سەر ناوهێنانیان، بێ سێ و دوو، ناوی (ئەدۆنیس) لە ریزی پێشەوەیە و لەم بوارەدا، بە توانایەکی لەبن نەهاتووی شاعیرانەوە، تاقیکردنەوە دوای تاقیکردنەوە، دەست ڕەنگینیی خۆی نواندووە و بۆتە لووتکەیەکی دیار و هەمیشە لەبەرچاو... چونکە کەرەسە و داروپەردووی خانووسازیی شیعری ئەدۆنیس، لە هیچیان ناچێ و

(١) ئەم وتارە ساڵی (١٩٨٩ز)، واتە پێش مەرگی (عبدالوهاب البياتي و نازك الملائكە) نووسراوە.

وەك هیچیان دەست بۆ ئەو بابەت و وێنەی شیعری و ڕەمزانە، نابات كە هاوڕێكانی پێش خۆی و ئەوانەی سەردەمی خۆی، بەكاریان دێنن...

ئەدۆنیس بەدیدێكی شاعیرانە، سەیری ئایدلۆژیا و كێشەكانی ژیان و مردن و گەردوون و گۆڕان دەكات و شیعر، بە یەكێك لە پێویستییە گرنگەكانی ژیانی مرۆڤایەتی دەزانێ و پێی وایە كە: (شیعر) سییەكانی ئەم جیهانەیە و جیهانیش بە بێ هەوای شیعر، بە بێ هەڵمژینی هەناسەی شیعر، ناتوانێ هەناسە بدات و بژی... هەر لەبەر ئەمەشە نازناوی ئەفسووناوی (ئەدۆنیس)ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، كە ناوی خواوەندی پیت و بەرەكەتی یۆنانی كۆنە و مەبەستی لە هەڵبژاردنی نازناوەكەیشی ئەوەیە، بڵێ: شیعر، پیت و بەرەكەت و هات و ئاشتی و ئاسوودەیی جیهانە.... ئەگینا خۆی ناوی (عەلی ئەحمەد سەعید)ە.

(ئەدۆنیس) بەو هۆیەوە كە جگە لە زمانی (عەرەبی)، زمانی (فرەنسی)ش باش دەزانێت... گەلێ بەرهەمی شاعیرانی ناوداری فرەنسایی، بۆ عەرەبی تەرجەمە كردووە... وەك زۆربەی شیعرەكانی شاعیری گەورەی فرەنسایی (سان جۆن پێرس)و بەو هۆیەشەوە كە پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ زۆر لە نووسەرانی ناوداری فرەنساییدا هەیە، بۆیە ژیانی ئەم دواییەی (ئەدۆنیس)، لەنێوان (سووریا)و (فرەنسا)دایە... بەڵام هاوسەرەكەی (خالِدة سَعید)، كە مامۆستای زانكۆیە لە (سووریا ـ دمیشق)، ئەویش یەكێكە لە ڕەخنەگرە ناسراوەكانی ئەم سەردەمەی شیعری عەرەبی....

ئەم چەپكە شیعرەی (ئەدۆنیس)، كە ڕاستەوخۆ لە عەرەبییەوە، بۆ كوردیم تەرجەمە كردوون، لە دەیەمین دیوانی شیعری ناوبراوم هەڵبژاردوون، كە وەك وترا، ناوی ناوە (بە یادی شتە نادیارە ئاشكراكانەوە ـ ١٩٨٨ز)و بۆ ئەوەش خوێنەران (بە تایبەتی خوێنەرانی كوردستانی ئێران[٢]، كە ئاگاداری كەمیان لە سەر ئەم شاعیرە هەیە) بتوانن لە ئەزموون و تایبەتمەندێتی ئەم شاعیرە گەورەیە

---

(٢) ئەم وتار و تەرجەمەیە، لەوكاتەدا كە لەشاری سەقز دەژیام، بۆ گۆڤاری (سروە) نووسراوەو لە ژمارەكانی: (١٠١ ـ ١٠٢)دا بڵاوبۆتەوە.

ئاگادار بن، هەوڵم داوە لە چەند شیعرێکی زیاتر تەرجەمە بکەم و لە تەرجەمەکەشدا ئەوپەڕی تەقەللام داوە لە مەبەستی ئەدۆنیس نزیك ببمەوە... لە هەمان کاتیشدا ئەوەیان بە یاد دێنمەوە، کە ئەم چەپکە شیعرەی ناو ئەم دیوانەی (ئەدۆنیس)، ئەوە لە هەستیاندا نەچەسپێنێ، کە ئەم شیعرانە، نموونەی سەرتاپای کار و ئەزموونی شیعری (ئەدۆنیس)ن... بەڵکوو وەك لە سەرووتر وتمان: تاقیکردنەوەی شیعری (ئەدۆنیس)، بە پێچەوانەی ئەو شاعیرانەوە، کە هەموو شیعرەکانیان لە یەك دەچن و یەك تاقیکردنەوە و یەك بۆن و بەرامە و کەش و هەوایان هەیە. بەڵام ئەدۆنیس لە هەر قۆناغێکی ژیانییەوە، بۆ قۆناغێکی تری ژیانی و بەواتایەکی تر: لە دیوانێکی شیعرییەوە، بۆ دیوانێکی شیعری تری، یەکجار جیاواز و تایبەتە، کە هیچیان لە هیچیان ناکەن... بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەوەی شوێن پێی تێکڕای کار و داهێنانی (ئەدۆنیس)ی هەڵگرتبێ، دەتوانێ لە نێوان هەموو ئەزموونەکانی شیعری جیاجیای ئەدۆنیس دا، تاقیکردنەوەیەکی یەکگرتووی گەورە و سەرکەوتوو، بەدی بکات، کە بە هەمووی (ئەدۆنیس)یان پێکهێناوە و بوونەتە ناسنامەو تایبەتمەندیی شیعری ئەدۆنیس....

لەم دیوانەیدا کە ئەم چەپکە شیعرەیمان لێ هەڵبژاردووە، ئەدۆنیس هەوڵی داوە بە شێوەیەکی جیاواز تر لە تاقیکردنەوەی ناو دیوانە شیعرییەکانی پێش ئەم دیوانەی، بەکورتترین وشە و رستە... وێنەی شیعری گەورە و کەرەسەی تازەی شیعریی زۆر جیاواز، ئاسۆی خەیاڵی شیعرییمان، بە شێوەیەك داچڵەکێنێ، کە پێشتر خۆمان بۆ ئامادە نەکردووە... بە واتایەکی روونتر: ئەمجۆرە ئەزموونەی ئەدۆنیس، بۆ ئەو خوێنەرانەی کە دەقیان بە رەمز و کەرەسە و کەش و هەوای شیعری ترەوە، گرتووە... زۆر سەیر و نامۆیە و رەنگە تا درەنگانێك هەستیان لەگەڵ ئەمجۆرە شیعرانەدا، هۆگر نەبێ.... تا دوای ئەوەی چەند جارێك ئەم شیعرانە دەخوێنرێتەوە... ئەوسا وردە وردە هەست دەکرێ، کە جیهانی خەون و خەیاڵی ئەدۆنیس، یەکجار جیاوازە و مەودای ئاسۆی چەژی شیعرییمان، ئەوەندە بەربڵاو دەکات، کە بە ئەندازەی باڵندەیەکی کۆچەریی، حەز بە فڕینی دوور و دیتنی کیشوەری نەدۆزراوە بکەین...

## بەیادی ئەو ـ ەوە
## (مەبەستی خۆیەتی)

هەر تاو نا تاوێك رووت دەبێتەوە،
بەڵام لە ـ وشە ـ زیاتر،
هیچ شك نابات، لەبەری بكات...

سەفەر دەكات...
بەهەنگاوەكانیدا تێپەڕ دەبێ،
دەچێتە ناو خەونەكانیەوە...

ماندوو دەبیت...
لە سێبەرەكەی خۆی زیاتریش.
هیچی تری نییە، تیایدا بحەسێتەوە...

بۆئەوەی خەمەكانی حەشار بدات
خۆی بە دەم ـ با ـ وە دەدات...

دۆستایەتی لەگەڵ ترس دا دەكات
بەڵام بۆ تەنیا ساتێك:
كە لە تاریكی دێتە دەرەوە...

نەخشەی زۆر دەکێشێ
بەڵام هەموویان دەدڕێنێ...

دەرگا لە سەر خۆی پێوە دەدات
نەك بۆئەوەی شادییەکانی ببەستێتەوە،
بەڵکوو بۆئەوەی خەمەکانی ئازاد بکات...

باسی مەرگی خۆی دەکرد و دەیوت:
مایینێکی دەستەمۆیە
لە هەیوانی رۆژەکانمدا، بەستراوەتەوە...

لە - ژیان - ی پرسی:
کەی دەبیتە هاوڕێم؟
وتی: ئەوکاتەی (مردن) دەبێتە دۆستت

گوێی لێیە، هەتاو بۆ رۆژەکان دەدوێ
گوێی لێیە، رۆژەکان بۆ شەو دەدوێن
گوێی لە شەویشە، هاوار دەکات:
گوێم لێ نییە...

چەند دەکۆشێ، تا بیرەوەرییەکانی
خۆی بسڕێتەوە...
ئایندە، قوت دەبێتەوە، تا بیسڕێتەوە
چەندیش دڵی هەڵمەت دەبات،
تا پێش ئایندەی بکەوێ،
لەشکری بیرەوەری، ئابلۆقەی دەدا...

ئەو پەرژینەی دەیپارێزێ،
هەر ئەو دیوارەیە، کە ئابلۆقەی دەدا،
ئای لەم بازنەیە...!

ئەرێ، ئەی مرۆڤ! ... خوێنەکەی خۆت،
تاقە رووناکییتە...؟

دەڵێت: مانگ زەریاچەیە...
ئەوینیشی بەلەم
بەڵام کەنار، گومانی هەیە...

خۆر ـ ێك لە باوەشیدا دەمرێ،
نایەڵێ شەو، کفنی بکات...

هەر خۆشی ـ یەکانیتی،
کە ـ ژێ ـ بۆ خەمەکانی دروست دەکەن

خەمەکانی ئەسپێکە،
خەریکە لەسەر زینەکەی، فڕێی دەداتە خوارەوە...

سەرکەوتنی لەوەی بە دەستی هێناوە،
ئەو ژێرکەوتنەیە،
کە هیچی بە دەست نەهێناوە

## (بەیادی ڕۆژ و شەو ـ ەوە)

ڕۆژ، پەرژینی باخەکەی دادەخات
پێ و پلی دەشوات و جبەکەی لەبەر دەکات
تا پێشوازی لە (شەو)ی هاوڕێی بکات

کازیوە، بە ئەسپایی دێتە پێشەوە
سەرشانەکانی پەلەی خوێنیان پێوەیە
گوڵێکیش، لە لەپی دەستیدایە،
خەریکە هەڵوەرێ

شەفەق، بە ژاوەژاو بەرایی دێت
دەستەکانی کتێبی کات دەکەنەوە و
هەتاو ـ یش لاپەڕەکانی هەڵدەداتەوە...

لەبەر دەرگای ئێوارەدا،
ڕۆژ ـ ئاوێنەکانی خۆی دەشکێنێ،
تا بتوانێ بخەوێ...

ڕۆژەکان،
نامەن، زەمان بۆ خەلکیان دەنووسێ،
بەڵام بە بێ قسە.
هەموو ڕۆژێك،

هەتاو منداڵێکی دەبێت،
ناوی دەنێت، بەیانی
بەڵام زۆر عومر ناکات...

ساتەکان، شەپۆلی کات ـ ن،
لەش ـ یش، رۆح

زەمان، (با)یەکە،
لای (مردن)ەوە هەڵدەکات

ئەوە بەرە بەیانە
لە سەر باڵکۆنەکەش،
گوڵ پێلووەکانی هەڵدەگلۆفێ
لە پەنجەرەکەشدا،
قژی هەتاو، شەپۆل دەدات

رۆژ، بە هەر دوو دەستی، شت دەبینێ
شەو ـ یش، شتەکان بە سەرتاپای
لەشی دەبینێ...

ئەگەر رۆژ بووایە
مژدەی هاتنی شەو ـ ی دەدا...

زستان: تەنیاییە
هاوین: لێك دابڕانە
بەهار ـ یش لە نێوانیاندا، پردە،

هەر تەنیا پاییز:
لە نێوان هەموو وەرزەکاندا هاتوچۆ دەکات

کات: کێوێکە، رۆژ و شەوی بە سەرەوەیە،
رۆژ: هەر پیایدا سەردەکەوێ و
شەو ـ یش، دێتە خوارەوە

رۆژ، لە باخەڵی شەو ـ دا نەبێ
نازانێ بخەوێ

مانگ: لە سەر باڵکۆنی شەو
شەونخوونی دەکێشێ.

رابووردوو، زەریاچەیەکە،
بۆ تاقانە مەلەوانێك، کە ناوی: بیرەوەرییە.

رووناکایی، کراسێکە،
زۆر جاری وا دەبێ، شەو، بیچنێ.

تاریك و رووني بەیانی،
تاقانە سەرینێکە،
کە رۆژ و شەو،
لە سەری،
باوەش بە یەکدا دەکەن.

خەونەکانی شەو،
هەودا ـ ن، کراسی رۆژ ـ یان پێ دەچنین

**(بە یادی با ـ و درەخت ـ ەوە)**

بە رووت و قووتی
با ـ پیاسە دەکات

ئەگەر ئاسمان بگریایە (وەك هەور دەڵێت)
دەبووایە ـ با، مێژوویەکی فرمێسك بووایە..

درەخت... کچێنی ـ با ـ یە...
لە تۆز و گەردا، بەر پەنجەکانی ـ با ـ دەکەوم
لە ـ با ـ دا، نووسینەکانی تۆز و گەرد
دەخوێنمەوە.

تۆز و گەرد، لەش ـ ێکی هەیە،
هەر بە تەنیا لەگەڵ ـ با ـ دا سەما دەکات

هەوا،
تاقانە عاشقێکە،
کە لەگەڵ ئاگر ـ دا بە کراسێك دەخەون

با ـ دەستی راستی دەخاتە سەر شانی
گوڵ،
تا دەستی چەپی بخاتە گیرفانەکانی گوڵەوە،
با ـ بۆن دەدزێ.

ئای لە با ـ !...
چونکە لە شاردا، گەورە و
لە لادێ ـ دا، ئەسپە....!

با ـ ئەو نامانە ئیمزا ناکات،
کە دەیاننووسێت.

باران، گۆچان و دار دەستی هەوایە و
هەوا ـ ش، جۆلانەی بارانە

هەور، کتێبن و
با ـ دەیاندڕێنێ...

تۆز و گەرد، ئەو شتانە دەخوێنێتەوە،
کە نایانبینێ...
با ـ ش ئەو شتانە دەڵێ، کە نایانزانێ

هەموو شتێك عەرش ـ ێكی هەیە،
تیایدا دابنیشێ...
بێجگە لە ـ با
چونکە هەر خۆی، عەرشی خۆیەتی

هەوا، تاقانە عاشقێکە،
لە کاتێکدا دەیەوێ لەگەڵ عاشقێکی تردا
بنوێ،
کەچی درەخت، لە تەکیدا سەما دەکات

با، ژێ ـ یەکی مەلەوانی ناو ئاسمانە،
هەر خۆیشی موزیکژەن و
موزیکەکەشە...

درەخت، خەونی هەیە،
لەسەر سەرینی با ـ ش نەبێ،
خەبەری نابێتەوە...

هەنگاوەکانی با، ڕەنگن
وا لە ئاسمان دەکەن،
هەمیشە بێداربێت...

درەخت، حەز دەکات
ئەو گۆرانییانە بڵێت،
کە با، لە یادی نەماون

## (بە یادی تەنیایی ـ یەوە)

تەنیایی باخێکە...
بەڵام تاقە درەختێکی تیدایە...

دوێنێ، کە لە خەو هەستام
هەتاو ـ م دی، پێلووەکانی بە شووشەی
پەنجەرەکەم هەڵدەگلۆفت

ڕۆژانی رابووردووم، گۆڕ ـ ە،
بەڵام تەرمی تیدا نییە.

ئای لە بیرەوەریم، چەند سەیرە !
بێستانێکی پڕ درەختی هەمە جۆرەیە،
بەڵام تاقە بەر ـ ێکی تێدا نابینم

ئەو وشانەی دەیانزانم،
هەموویان بوونە باخێکی خەم

هەندێ جار هەست دەکەم
ئەو رەوەزەی، بە سەریدا
دەڕوانم،
جێی هەنگاو هەڵهێنانمی تێدا نابێتەوە

هەرچی  جارێ، پرسیار دەکەم،
دەبم بە دوو بەشەوە: پرسیار و من،
پرسیارەکە بە دوای وەڵامدا دەگەڕێ و
منیش بەدوای پرسیاری تردا.

ئەو شەوە... بۆ هەستم کرد
کە ئاسمان، تار ـ ی شەوە،
ئەستێرەکانیش، ژێیە پچڕاوەکانی!
هۆی ئەوە بوو، کە بە تەنیا خەوتم؟

ئێستا دەزانم،
بۆچی، زۆرجار ئەوانە، ستایشی
تاریکایی دەکەن
کە بە تەنیا خەون بە رووناکییەوە دەبینن

لە شەودا گوێم لە زەنگ دەبێ
بانگەوازی سێیەمین لە دایکبوونم
رادێڵێ....

هەموو ئەو شتانەی دەمنووسین،
لە یادم چوون...
ئێستا ئەو لە یاد چووانە،
من دەنووسمەوە...

دەنووسم....
ئەمەش تاکە رێگەیەکی هەڵبژاردەیە،

تا خۆت بخوێنیتەوە و
گوێ لە جیهان بگریت....

ئەو کڵپە ئاگرەی ڕێنماییم دەکات
لێی یاخی دەبم...
ئەو کڵپەی ئاگرەی ڕێنمایی دەکەم،
لێم یاخی دەبێ....

زەریاچەیەك بۆ (بیر چوونەوە) دەخەمە
سەرپشت،
مێژووی خۆمی تێدا نقوم دەکەم

روخساری خۆتم بدەیتێ، نیازەکانمت
دەدەمێ...
ژووانیشمان، خوڕەی ئاوە
کەواتە. ئەی زەریا، دەتوانیت
پەلکێشم بکەیت...

چی لەم ئاسمانە بکەم،
کە وەك گوڵ، بە سەر شانمدا هەڵدەوەرێ!؟

هەرچی لە دەورێتی، دەسووتێ...
ئاگر لە هەوادا و ئاگریش لە ئاودا...
ئەی ئەم سەرمایە چییە،
کە بە ئەندامەکانی لەشیدا، دێ و دەچێ؟

## (به یادی شته نادیاره ئاشکراکانەوە)

ئافرەت...
هەورێکە، فرمێسك دەبارێنێ

نائومێدیی... پەنجەی هەیە،
لە پەپوولەی مردوو زیاتر،
هیچی تر ناگرێ.

رووناکاییی.... بەرگری ناکات...
رووناکاییی....
یان هێرش دەکات...
یان خۆی بە دەستەوە دەدات

زەریا... نازانێ بنوێ....
یان سەما بکات....
تا خۆی رووت نەکاتەوە....

ژمارەی روخساری ئاسۆ، بە ئەندازەی
ژمارەی
ئەو چاوانەیە، کە بۆی دەڕوانن...
رووناکیش، لەش ـ ی زۆرە...
بەڵام هەر تەنیا یەك روخساری هەیە

زەریا، دەرفەتی ئەوەندە نییە،
لەگەڵ لمدا بدوێ...
چونکە هەموو کاتی خۆی،
بۆ دەستەمۆ کردنی شەپۆل، تەرخان کردووە...

ئاسمان، کڵاوێکە،
بەشی هەموو سەر ـ ەکان دەکات....

بەفر،
هاوڕێی ماندوو بوون و
برای پیرێتی ـ یە

هەور، هاوار ناکات...
قسەش ناکات...
بەڵام هەموو شتێکیش دەڵێت،

وشە، دەبوونە باڵندە...
زیندەوەران، هەموو رووەو مردن دەچن..
جگە لە مرۆڤ
کە: مردن، دێت بۆ لای

شادمانیی، باڵی هەیە و
لەشی نییە...
هەتاو، خانوویەکی هەیە
هیچ رێگایەکی نییە

بەرد، بە خەوتوویی گۆرانی دەڵێ
تاریکایی، لە کرنۆشدا لە دایك دەبێ...
ڕووناکایی، بە پێوە، لە دایك دەبێ

گوڵ، بەشێکە لە چاو...
بۆن - یش، بەشێکە لە دڵ...

خەون: ئەو تاقەنە بێ تاوانەیە،
بەڕاکردنەوە نەبێ
ناتوانێ بژی....

بەرد، گوێ لە سروودی ئاو ناگرێ.

زۆر جار کێڵگە، لە کاتی چاوەڕێ کردنی
باراندا،
قژی لێ دەڕوێ

لەشی هەتاو، ڕووناکییەکەیەتی...
هەتاو، ئافرەتێکی ڕووتە،
کە هەرچی جلی هەیە، لەبەری کردبن...

نامەی گوڵ، بۆنەکەیەتی،
کە بە چرپە، پێمان دەگەیەنێ...

نهێنی... جوانترین خانووە...
بەڵام بۆ ئەوە دەست نادات،
تیایدا نیشتەجێ بیت...

ئەم... تەنیا چاوێك، تەنیا پێیەکی هەیە...
دەستیشی نییە....
هەور.... لەشێکی تەواوە

زەریا... دارستانێکە، سەما دەکات...
هەور... دارستانێکە، دەکشێ...

شەپۆلی... تار...ە،
ژێیەکانیشی، رۆخەکانن...
چۆلەکە.... نایەوێ لەو کێڵگانەدا گۆرانی بڵێت،
کە نازانن بێدەنگ بن....

هەور.... کتێبێکە،
ئاو، بۆ: تاقە خوێنەرێکی دەنووسێ، کە:
زەوی ـ یە.

رووناکیی... لەشێکە، هەرباڵەکانی دەبینین..
ئاو ـ یش، لەشێکە،
لە روخساری زیاتر، هیچی تر نابینین....
تاریکایی... هەر بەگێڕیی لە دایك دەبێ...
رووناکیی ـ ش، لەوساتەوە کە دێتە دنیا،
کۆچ دەکات....

رووناکیی.... دەفتەری سرووشتە
بە مەرەکەبێکی نەبینراوە،
لەسەری دەنووسرێ...

رووناکیی.... وەك منداڵێکە، لە نوێنی خەودا،
تەنیا چەکیشی، خۆبەدەستەوە دانێتی..

خۆڵەمێش، گریانی کڵپەیە و
پێکەنینی ئاگر.
هەر تەنیا ئاگر، کاتێ کە دەگری،
پێدەکەنێ...

پەپوولە... تاڵە هەودای رووناکییە...
هەر لەبەر ئەمەشە، کە ئاگر:
جوانترین جلێتی....

خۆر.... بە بێئەوەی هیچیش بجووڵێ،
هەمیشە پێشمان دەکەوێ....

ڕووناكیی.... تا كراسی تاریكی لەبەر نەكات
ناتوانێ بخەوێ...

بیابان.... ئەوەندە بە دوای عەشقی
هەتاو ـ دا چوو....
تاسووتا....

كەناری زەریا... سەرینە....
شەپۆل، ئانیشكی لە سەر دادەدات...

ئای لە گێلێتی مانگ و
ئای لەو جوامێرییە پووچەی...
نازانێ قسە لەگەڵ ئەستێرەیەكدا بكات...
نازانێ وشەیەك بخوێنێتەوە....
ئەو خەرمانەیەش، كە لە دەورێتی....
هیچ نییە، ئەویش كراسێكی خواستراوە..

هەور.... جلێكە....
هیچ لەشێك ناتوانێ لەبەری بكات

خۆڵەمێش.... هەمیشە ڕوانینێكیماڵئاوایی
هەیە...
ئاگر ـ یش، هەمیشە ڕوانینێكی
بە یەك گەیشتنی هەیە....

ئاو.... بچێتە هەر شوێنێك،
ئەو شوێنە دەکاتە شوێنی نووستن و
لێی رادەکشێ...
بە نوستنیشەوە رێ دەکاو
بە دانیشتنیشەوە، هەڵدەسێ و
کار دەکات...

زەریا... بە دەگمەن گۆرانی دەڵێت
هەر بۆ ئەوە خولقاوە: سەما بکات

باغ - ئافرەتێکە،
لەشی لە گڵدایە و
جل و بەرگیشی: گیا

خۆر... لەو کاتانەشدا کە خەمگین دەبێ،
لە رووناکایی زیاتر، ناتوانێ هیچی تر،
لەبەر بکات -

تاریکایی... زۆردارێکە، ئابلۆقەی جێگاکە
دەدات،
رووناکایی - ش، سوارێکە،
جێگاکە رزگار دەکات...

گوڵ... بەلەمێکە، بە هەوادا ڕێ دەکات
یەك کەسیشی سوار کردووە،
کە: بۆنەکەیەتی

بە دڵنیاییەوە، خۆر ـ یش خۆی،
کە ئەم ئاسمانە جێدەهێڵێ...
بە هەڵە... دەچێتەوە ماڵەکەی خۆی

## (بەیادی یارییەکانی ژیان و مردنەوە)

مردن... هەر لە دواوە دێت...
تەنانەت ئەو کاتانەش، کەوا دەردەکەوێ لە
پێشەوە هاتووە....
پێشەوە.... هەر تەنیا بۆ ژیانە

زمان.... لە ئاکامی زۆر بڵێی... ژەنگ دێنێ
چاو ـ یش، لە کەم خەون بینین، ژەنگ دێنێ...

روخسار... رووناکایی لەشە
کە روخسار تاریک دایەت،
سەرتاپای لەش، دەکوژێتەوە

ئاسمان... دەتخوێنێتەوە...
بەڵام دوای ئەوەی: زەوی، دەتنووسێ

زۆرجار، هێڵی راست
رێگایەکە، دەچێ بۆ هیچ کوێیەک

مرۆڤ.... کتێبێکە،
هەمیشە ژیان، دەیخوێنێتەوە
مردنیش، لە یەک سات و لە یەک جاردا

دەیخوێنێتەوە...

ئاواز... بۆ گوێچکەیە...
ڕەنگ... بۆ چاوە....
وشە ـ ش، بۆ سەرتاپای لەشە

بەهار.... گەیشتە باخچەی ماڵەکە ـ
بۆخچەکانی داگرت و

لە ژێر لێزمەی بارانێکدا، کە بە گیانیدا دەچۆڕا،
کەوتە دابەشکردنیان
بە سەردرەخت و ڕووەکدا....

بۆچی شاعیر، هەمیشە هەڵە دەکات:
بەهار، گەڵاکانی خۆی دەداتێ و...
ئەویش، دەیاندات بە مەرەکەب؟

خۆر... بە ڕووناکاییەکەی داماندەپۆشێ
بێئەوەی دەربەستی ئەوەمان بێت
کە باوەش کردنە بەردەوامەکەی پیاماندا،
ماڵئاواییەکی بەردەوامە...

زۆرجار، جوانترین چرا... ئەوانەن:
بۆ ئەوە هەڵیان دەکەین،
نەك ڕووناکییان پێ ببینین،
بەڵکوو بۆئەوەی تاریکایی ببینین....

رەشایی.... چاولێکنانی سروشتە
لە باوەشی گەردووندا

رەنگەکان... تیپێك موزیکی گەڕۆکن،
رەنگی رەش: پێشەنگیانە

هەموو رەنگەکان پێکەوە، وا دەنوێنن:
رووتن... یان جل و بەرگیان لە بەردایە.
بە تەنیا رەنگی رەش نەبێت،
کە: جلی رووت لەبەر دەکات.

سپێتیی... دوگمەکانی جێگاکە دەکاتەوە
رەشایی ـ ش، دایاندەخاتەوە...

بۆ هەر کوێ بچیت...
روو لە هەر کوێ بکەیت...
قووڵایی خۆت... دوورترین شوێنە

ژیانی بەرد، کۆتایی بۆ نییە
چونکە بە مردوویی دەژی.

## بەیادی ئەو . ەوە
## (مەبەستی لە ئافرەتە)

.... لەش،
جوانترین خانووە،
کە خەیاڵ تیایدا نیشتەجێیە...

روانینم بە سەرتاپای لەشیدا
پەرتەوازە دەبێ
بەرینترین ئوقیانووس
لەشی ئافرەتێکی عاشقە

کە دەمبینێ،
گڕ لە روخساری دەبێتەوە
من... ئاگرە شاراوەکەی ئەوم

بۆچی بیرەوەرییەکانت، لێم نابنەوە؟
با ـ ش، خۆی گوێی لێم نەبوو
کە وتم: خۆشم دەوێی

ئەو ئافرەتەم بینی، کە پەڕەسێلکەی دیبوو
پەرەسێلکەش، بەهاری دیبێ..
ئەویش تۆ بوویت...

## (بەیادی منداڵییەوە)

زۆر جار... هەوا ـ م دیوە،
بە دوو پێی لە (گیا) دروستکراو،
ڕۆیشتووە....
ڕێگا ـ ش، بە دوو پێی لە (هەوا) دروستکراو،
سەمای کردووە....

هەر زوو زامدار کرام...
هەر زووش زانیم،
ئەو زامانە، منیان خولّقاند

هێشتاش لە پشت ئەو منداڵەوە دەڕۆم
کە هێشتا لە ناو ئەندامەکانی لەشمدا
دەڕوات....
ئێستا.... بە سەر لووتکەی پەیژەیەکی
رووناکییەوە وەستاوە و
لە گۆشەیەك دەگەڕێ، تیایدا بحەسێتەوە
بەڵام بۆ ئەوەی سەرلەنوێ،
روخساری (شەو) بخوێنێتەوە.

بەڕێدا دەڕۆم...
دەستێکم لە هەوا ـ دایە و
دەستەکەی ترم، بە ناو قژێکدا دەگێڕم،
کە خەیاڵی لێ دەکەمەوە

هەر بە تەنیا ئەو کەسەی
تێکەڵ بە ئاسۆ دەبێ،
دەتوانێ ڕێگەیەکی تر بکاتەوە...

هێشتا منداڵییم، لە ناو لەپی
ئەو ڕووناکییەدا لە دایك دەبێ
کە ناوەکەی نازانم،
هەر ئەویش، ناوی من دەنێت

ڕۆژەکانی.... زەریاچەن...
بیرەوەرییەکانیشی:
لەشی سەر ئاو کەوتوو*

---

* گۆڤاری **سروە**، ژمارە (١٠٢ ـ ١٠٢).



## ئەدۆنیس

### بەرهەمەکانی:

**شِعر**

- قصائد أولى، دار الآداب، بيروت، ١٩٨٨.
- أوراق في الريح، دار الآداب، بيروت، ١٩٨٨.

- أغاني مهيار الدمشقي، دار الآداب، بيروت، ١٩٨٨.
- كتاب التحولات والهجرة في أقاليم النهار والليل، دار الآداب، بيروت، ١٩٨٨.
- المسرح والمرايا، دار الآداب، بيروت، ١٩٨٨.
- وقت بين الرماد والورد، دار الآداب، بيروت، ١٩٨٠.
- هذا هو اسمي، دار الآداب، بيروت، ١٩٨٠.
- منارات، دار المدى، دمشق ١٩٧٦.
- مفرد بصيغة الجمع، دار الآداب، بيروت، ١٩٨٨.
- كتاب القصائد الخمس، دار العودة، بيروت، ١٩٧٩.
- كتاب الحصار، دار الآداب، بيروت، ١٩٨٥.
- شهوة تتقدّم في خرائط المادة، دار توبقال للنشر، الدار البيضاء، ١٩٨٨.
- احتفاءً بالأشياء الغامضة الواضحة، دار الآداب، بيروت، ١٩٨٨.
- أبجدية ثانية، دار توبقال للنشر، الدار البيضاء، ١٩٩٤.
- مفردات شعر، دار المدى، دمشق ١٩٩٦.
- الكتاب I، دار الساقي، بيروت، ١٩٩٥.
- الكتاب II، دار الساقي، بيروت، ١٩٩٨.
- الكتاب III، دار الساقي، بيروت، ٢٠٠٢.
- فهرس لأعمال الريح، دار النهار، بيروت.
- أول الجسد آخر البحر، دار الساقي، بيروت، ٢٠٠٣.
- تنبّأ أيها الأعمى، دار الساقي، بيروت، ٢٠٠٣.
- تاريخ يتمزّق في جسد امرأة، دار الساقي، بيروت، ٢٠٠٧.
- ورّاق يبيع كتب النجوم، دار الساقي، بيروت، ٢٠٠٨.

**الأعمال الشعرية الكاملة**

- الأعمال الشعرية الكاملة، دار المدى، دمشق، ١٩٩٦.

**دراسات**

- مقدمة للشعر العربي، دار الفكر، بيروت، ١٩٨٦.
- زمن الشعر، دار الساقي، بيروت، ٢٠٠٥.
- الثابت والمتحول، بحث في الإبداع والإتباع عند العرب،

١. الأصول،

٢. تأصيل الأصول،

٣. صدمة الحداثة وسلطة الموروث الديني،

٤. صدمة الحداثة وسلطة الموروث الشعري،

دار الساقي، بيروت، ٢٠٠١.

- فاتحة لنهايات القرن، دار النهار، بيروت.
- سياسة الشعر، دار الآداب، بيروت ١٩٨٥.
- الشعرية العربية، دار الآداب، بيروت ١٩٨٥.
- كلام البدايات، دار الآداب، بيروت ١٩٩٠.
- الصوفية والسوريالية، دار الساقي، بيروت ١٩٩٢.
- النص القرآني وآفاق الكتابة، دار الآداب، بيروت ١٩٩٣.
- النظام والكلام، دار الآداب، بيروت ١٩٩٣.
- ها أنت أيها الوقت، (سيرة شعرية ثقافية)، دار الآداب، بيروت، ١٩٩٣.
- موسيقى الحوت الأزرق، دار الآداب، بيروت، ٢٠٠٢.
- المحيط الأسود، دار الساقي، بيروت، ٢٠٠٥.
- كونشيرتو القدس، بيروت – بلومبرغ – باريس تموز اب ٢٠١٠.

**مختارات**

- مختارات من شعر يوسف الخال، دار مجلة شعر بيروت، ١٩٦٢.
- ديوان الشعر العربي،

١. الكتاب الأول، المكتبة العصرية، بيروت، ١٩٦٤.

٢. الكتاب الثاني، المكتبة العصرية، بيروت، ١٩٦٤.
٣. الكتاب الثالث، المكتبة العصرية، بيروت، ١٩٦٨.

ديوان الشعر العربي (ثلاثة أجزاء)، طبعة جديدة، دار المدى، دمشق، ١٩٩٦.

- مختارات من شعر السياب، دار الآداب، بيروت، ١٩٦٧.
- مختارات من شعر شوقي (مع مقدمة)، #تحويل دار العلم للملايين بيروت، ١٩٨٢.
- مختارات من شعر الرصافي (مع مقدمة)، #تحويل دار العلم للملايين بيروت، ١٩٨٢.
- مختارات من الكواكبي (مع مقدمة)، #تحويل دار العلم للملايين بيروت، ١٩٨٢.
- مختارات من محمد عبده (مع مقدمة)، العلم للملايين، بيروت، ١٩٨٣.
- مختارات من محمد رشيد رضا (مع مقدمة)، #تحويل دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٨٣.
- مختارات من شعر الزهاوي (مع مقدمة)، #تحويل دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٨٣.
- مختارات من الإمام محمد بن عبد الوهاب، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٨٣.

الكتب الستة الأخيرة وضعت بالتعاون مع خالدة سعيد.

**ترجمات**

- حكاية فاسكو، وزارة الإعلام، الكويت، ١٩٧٢.
- السيد بوبل، وزارة الأعلام، الكويت، ١٩٧٢.
- مهاجر بريسبان، وزارة الإعلام، الكويت، ١٩٧٣.
- البنفسج، وزارة الإعلام، الكويت، ١٩٧٣.
- السفر، وزارة الإعلام، الكويت، ١٩٧٥.
- سهرة الأمثال، وزارة الإعلام، الكويت، ١٩٧٥.

- مسرح جورج شحادة، طبعة جديدة، بالعربية والفرنسية، دار النهار، بيروت.
- الأعمال الشعرية الكاملة لسان جون بيرس،
- منارات، وزارة الثقافة والإرشاد القومي، دمشق، ١٩٧٦. طبعة جديدة، دار المدى، دمشق.
- منفى، وقصائد أخرى، وزارة الثقافة والإرشاد القومي، دمشق، ١٩٧٨.
- «فهرس لأعمال الريح» (٢٠١٢) دار "كشب" للشعر، تل أبيب، ترجمة إلى العبرية.
- مسرح راسين
- فيدر ومأساة طيبة أو الشقيقان العدوان، وزارة الإعلام، الكويت، ١٩٧٩.
- الأعمال الشعرية الكاملة لإيف بونفوا، وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٨٦.
- كتاب التحولات، أوفيد، المجمع الثقافي، أبوظبي، ٢٠٠٢.
- الأرض الملتهبة، دومينيك دوفيلبان، دار النهار، ٢٠٠٤

## الجوائز (خەڵاتەكانى)

- جائزة الشعر السوري اللبناني. منتدى الشعر الدولي في بيتسبورغ، الولايات المتحدة ١٩٧١.
- جائزة جان مارليو للآداب الأجنبية. فرنسا ١٩٩٣.
- جائزة فيرونيا سيتا دي فيامو روما. إيطاليا ١٩٩٤.
- جائزة ناظم حكمت. إسطنبول ١٩٩٥.
- جائزة البحر المتوسط للأدب الأجنبي. باريس، فرنسا.
- جائزة المنتدى الثقافي اللبناني. باريس، فرنسا ١٩٩٧.
- جائزة الإكليل الذهبي للشعر، مقدونيا ١٩٩٨.
- جائزة نونينو للشعر. إيطاليا ١٩٩٨.
- جائزة ليريسي بيا. إيطاليا ٢٠٠٠.
- جائزة غوته (فرانكفورت) (٢٠١١).

# بەیەك گەیشتن*

## چەنگیز ئایتماتۆف

(شۆردون)ی پیر ئەو ڕۆژە کە بۆ ماڵەوە گەڕایەوە، ئاکاری سەیر بوو، شلەژاویی و حەپەساویی، یان خەم و بێزاریی پێوە دیار بوو. ژنەکەی یەکسەر زانی شتێك ڕوویداوە، کە لێیشی پرسی چییەتی! ئەبڵەق بوو، چونکە تووشی غایلەیەکی سەیر ببوو.. شتێك هەر لە پڕوپووچیی پیرێتیی بچێت.. یان شتێك لەو بابەتە.. بەڵام شتێك کە هەرگیز لە پیاوێکی ساغ و سەلیم نە دەوەشایەوە..

ئەو پیاوە پیرە، بیست ساڵ لەمەوبەر کوڕێکی لە شەڕدا کوژرابوو، کوڕێکی جوان و قۆز.. کەس لە بیری نەمابوو، لە (شۆردون) زیاتر. (شۆردون)یش پێش ئەم ماوە دوور و درێژە، کە لەگەڵ ژنەکەیدا دەژیا، نیشانەیەکی یاد کردنەوە و ناوهێنانێکی کوڕەکەی پێوە دیار نەبوو.. کەچی لە پڕێکدا ئەم پیاوە پیرە، بڕیاریدا سەر لەو شوێنە بدات، کە کوڕەکەی پێش شەڕەکە تیایدا مامۆستا بووە.

---

* گۆڤاری ڕۆژی کوردستان، ژمارەی تایبەت بە شانۆ و چیرۆك، لە ساڵی ١٩٨٠

شۆردون وتی: "هەستێك تیامدا دەجوولێ کە کوڕەکەم زیندوو بێ و ئێستا لەوێ بێ.. هەست بە شتێك دەکەم بەرەو ئەوێ ڕام دەکێشێ.. دەمەوێ بیبینم".

ژنەکەی بە پەژارەوە سەیری کرد، لە سەرەتادا ویستی پێی پێ بکەنێ.. پێی بڵێ: بەڕاستتە! یان ئەرێ تۆ بەهەموو عەقڵتەوە وا دەڵێیت! دڵنیایت شێت نەبوویت!؟ بەڵام دوایی بەخۆیدا چووەوە، چونکە شێوەی گفتوگۆ و تێڕوانین و دەنگی.. هەموویان نیشانەی ئەوەیان تیدابوو، کە زۆر لەخۆی دڵنیایە، یان زۆر متمانەی بەخۆیەتی و بەڕاستی قسە دەکات. لەهەمان کاتیشدا بەهەموو هۆش و گۆشیەوەیەتی..

ئالەم کاتەدا، ژنەکەی سەرەڕای ئەوەش کە دەیزانی ئارەزووەکەی بێ سەرو بەر و بێ هوودەیە و پێ داگرتنەکەشی لەوڕکی منالێ دەچێ و پەشیمان کردنەوەشی گرانە، بەزەیی پیدا هاتەوە.. بە سڵەوە لێی پرسی:

ـ ئەرێ کەوابوو، بۆ لەمەو پێش نەچوویت بۆ ئەوێ؟

شۆردون هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی:

"نازانم، بەڵام ئێستا حەز دەکەم بچم. حەزیش دەکەم پێش مردنم بچم، هەستێکی زۆر تەواوم بەمە هەیە.. سبەینێ شەفەقی دەڕۆم".

ـ چیت پێ خۆشە وا بکە، کەیفی خۆتە.

ژنەکەی لای وابوو مێردەکەی بەخۆیدا دەچێتەوە و پەشیمان دەبێتەوە، لەو گوندە دوورە هیچ نابینێتەوە و هیچ بەدەست ناهێنێ. کەچی بۆچوونی ژنەکە وا دەرنەچوو، چونکە شۆردون پەشیمان نەبووەوە.

گوندەکەیان بە لاپاڵی ڕیزە گردێکەوە بوو، دەمێك بوو خەوی لێکەوتبوو، هەموو پەنجەرەکانیشی تاریك ببوون، جگە لە ماڵی (شۆردون)، کە جار جارە ڕووناکیی تیایدا دەکوژایەوە و دیسان هەڵ دەبۆوە.

(شۆردون)ی پیر جێی بەخۆی نەدەگرت.. ئەو شەوە چەند جارێك لە خەو هەستا و خۆی لەبەر دەکرد و دەچووە سەر بانیژەکەیان، هەموو جارێکیش باوەشێ وێنجەی دەخستە ئاخوڕی ئەسپەکەوە، وێنجەی کۆنیش نا بە تەنیا، بەڵکو چاکترین لەوەڕ، بەرهەمی یەکەم گیا دوورین بۆ وڵاخ، بەسەوزیی.. پەیتا

پەیتا هەر توێکڵ و سەوزەی تری بەسەر ئاخوڕەکە دەخست.. ئەو لەوەڕەی ئەمشەو، بەو جۆرە بەر ئەسپەکەی دەخست، پێشتر هەرگیز ڕێی بەخۆی نەداوە، ئاوا دەستی پێوە نەگرێ و سەرفی بکات، نەیشی هێشتووە کەسی تر دەستی بۆ بەرێ، تا زستان دەهات.. جاران تا زستان دەهات، وڵاخەکانی بۆ لەوەڕگایەکی پشت ماڵی خۆیان دەبرد، بەتوولە ڕێگا سەوزەکان و پاشماوەی درەوو، گەڵای وەریوەوە خەریکی دەکردن. کەچی ئەمشەو، دەستی بەهیچەوە نەدەگرت، تەنانەت هەگبەی ئەسپەکەشی پڕ لە قەرسیل کرد بۆ خۆ ئامادەکردنی سەفەرەکەی.

شۆردون ئەو شەوەی بەو جۆرە بەسەر برد، ژنەکەشی خەو نەچووە چاوی، بەڵام بۆ ئەوەی کۆسپ لەبەردەم سەفەری مێردەکەیدا دروست نەکات، خۆی کردبوو بە خەوتوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەرچی جارێ مێردەکەی دەچووە دەرەوە، ئەم خۆی لە جێی خۆیەوە هەناسەیەکی قووڵی هەڵ دەکێشا و دەیزانی تەقەللادان لەگەڵیدا بۆ پەشیمان کردنەوەی کەڵکی نییە.. ئەم حەزی دەکرد بڵێ:

"باشتر وایە پێش ئەوەی بڕۆیت، بیر بکەیتەوە، بیر بکاتەوە کە چۆن خەڵك لەدوایدا پێی پێ دەکەنن.. بەڵام هەر خۆی بێ دەنگ دەهێشتەوە، لەترسی ئەوەی نەوەك مێردەکەی پێی بڵێ:

"ئەگەر تۆش خۆت بەدایکی بزانیایە، پێت نەدەوتم مەچۆ..

" بەڵێ حەزی نەدەکرد گوێی لەمە بێت.. ئەم خۆی ئەو کوڕەی هەرگیز نەدیبوو.. نەیشی دەزانی لە چ جۆرە کوڕێکە، دایکی کوڕە، نۆ ساڵ دەبوو مردبوو، ئەم، دووەم ژنی بوو، گوزەرانیشی لەگەڵیدا زۆرجار گران بوو، چونکە هەمیشە و لە بەرامبەر دوو کچە بەشووەکەی، خۆی بە دەستە پارچە و تاوانبار دەزانی، کە لەگەڵ ماڵ و مێردی خۆیاندا لەشار دەژیان.. سەریان لە باوکیان نەدەداو پەیوەندیشیان لەگەڵیدا نەبوو.. باوکیشیان مەگەر بەدەگمەن بیری بکردنایە، ئەو کاتانەی کە بۆ شار دەچوو، سەری لێ دەدان.. لەم ڕووەوە ئەم هیچی لێ نەدەپرسی... بۆ ئەم جۆرە دار و بارانە چاکتر وایە باوەژن خۆی تێوە نەگلێنێ.. هەر ئەمەش بوو لەمەدا وای لێ کردبوو قایل بێ بەو کەڵکەڵە و خەیاڵەی

مێردەکەی کەوتۆتە سەریەوە، چونکە هەرچەند بیری لێ دەکردەوە، دەیزانی ئەمیش جۆرە سۆزێکە و بەڵکو بەم سەردانە، کەمێك ئۆخژنی بگاتێ و کەف و کوڵی دابمرکێتەوە.. یان هیچ نەبێ خەمەکەی برەوێنێتەوە..

هێشتا گزنگی نەدابوو، کە شۆردون چوو بەلای ئەسپەکەیەوە و زینی کرد و قامچیەکەی، کە بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو، دایگرت.. لەبەر گزنگی شەفەقی ناو پەنجەرەکەشیاندا بەسەر ژنەکەیا شۆڕ بووەوە، کە هێشتا لەناو جێگەکەدا بوو، پێی وت:

ـ (نسیبکان) من دەڕۆم.. دڵت هیچ نەکات، سبەی ئێوارە دەگەڕێمەوە، گوێت لێیە؟. بۆ دەنگت نییە؟ ها! تێم بگە، ئەوە کوڕمە، هەرچەندە هەموو شتێکیش باش دەزانم، بەڵام هەر حەز دەکەم خۆم بچم، سەرێك لەوێ بدەم، دڵم وام پێ دەڵێ.. تێم دەگەیت؟.

ژنەکەشی بەبێ دەنگیی هەستا، وا خۆی پیشاندا، کە تەواو هاتبێتە سەر عەقلی مێردەکەی و پێی وت:

ـ دەبوایە سەیری شەپقەکەتت بکردایە، هەمووی پەڵەیە، جوان نییە، خۆتۆ بۆ دەشتاییەکەی بەر ماڵی خۆمان ناچیت، بۆ زیارەت دەچیت.

ژنەکەی دەستی بۆ سندوقی ژوور جێی نووستنەکەیان برد، شەپقەیەکی خوری دەرهێنا، کە دەمێك بوو لەوێدا شاردبوویەوە، دایە دەستی مێردەکەی و پێی وت:

ـ ئەمەیان لەسەر بکە. جوان نییە بەو شەپقە چڵکنەوە بچیت..

شۆردون شەپقەکەی گۆڕی و ڕووەو دەرگاکە ڕۆیشت. ژنەکەشی بانگی کرد:

ـ ئا، کەمێك ڕاوەستە، توێشەبەرەی نان خواردنەکەت لەسەر ڕەفەی پەنجەرەکەیە، بیخەرە هەگبەکەتەوە، تا ئێوارە بە ڕێگاوە برسیت دەبێ.

شۆردون ویستی پێی بڵێ سوپاست دەکەم، بەڵام بێ دەنگ بوو، چونکە باو نەبوو پیاو، سوپاسی ژنەکەی بکات.

گوندەکە هێشتا لە شیرینی خەودا بوو، کە شۆردون لەپشت ماڵانەوە بۆی دەرچوو، تا سەگەلەکەی ئاوایی بەهەوانتە نەوەڕن.. لەتەنیشت گوندەکەوە بەهەندێ تووڵەڕێدا لای کردەوە، کە ڕووەو چیاکە دەیبرد..

نیوەڕۆی ڕۆژی پێشووتر، شۆردون بەهەمان توولەڕێگادا ڕووەو مالەوە دەگەڕایەوە، کە عەرەبانە شڕە دوو پێچکەکەی پڕ کردبوو لە لێژنە دار و بۆ زستان کەڵەکەی دەکرد.. ئەو ڕۆژە لەدەم دەربەندی (گۆرج)ی بچووکدا، لق و پۆپی درەختی دەبڕی و عەرەبانەکەی لێ بار کرد و لەسەر کورسی لێ خوڕینەکە دانیشت، هەردوو قاچیشی لێ درێژ کردو بە دڵخۆشییەوە خۆی دا بە دەم ڕەوتی عەرەبانەکەوە، کە شارەزای ئەو ڕێگا سەختە بوو، عەرەبانەش هەر دەیناڵاندا..
ڕۆژێکی گەرم و هێمن بوو.. لەوێ، لەپاییزاندا ئەوکاتە، چاوەڕوان دەکرێ پلەی گەرما نزم ببێتەوە، بەڵام پێش ئەوەی ئەمە ڕووبدات، ئەو چەند ڕۆژە هەر لەخۆیانەوە ڕووناك و گەش و سامالێ بوون.. ئەو ڕۆژە گوندەکانی ئەو دەوروبەرەی بەو بنارانەوەن، جوان دەبینران.. گوندەکانی ناو دۆڵەکانیش باخەکانیان بەری ئاسمانیان گرتبوو.. دیواری ماڵەکان بەگڵەسپی سواخ درابوون، ڕووەکەکانی ناو کێڵگەکانی تووتنیش وشك ببوون.. تراکتۆرەکانیش خەریکی درەوی کێڵگەی پاییزە بوون.. ئاسۆش توێژاڵی دوکەڵی مەیلەو بنەوشەیی لەهەنێ جێگای نزمی سەر شاردا پێوە بوو.. بەسەر ئەمانەشەوە پۆلێك مەل بەبێدەنگیی دەفڕین.. شۆردون دەیزانی ئەو مەلانە پەڕەسێلکەن.. بەرەبەیان، کە بۆ داربڕین هات، پەڕەسێلکە بە پۆل، بەسەر تەلی تەلەفۆنەکانەوە نیشتبوونەوە، ڕیز ڕیز بەرامبەر بەیەك بەبێ جووڵە هەڵنیشتبوون، هەریەکەیان سنگی سپی و سەریشیان زۆر سەیر بوو، کلکیشیان وەك دڕك دەبریسکایەوە، بەهێمنیی نیشتبوونەوە، جارجارە بە زیقەی پەنگ خواردەوەبوو بۆ یەکتریان دەخوێند، لەوە دەچوو هەموویان چاوەڕێی ئەوە بکەن، لەساتێکی دیاریکراودا بەیەکەوە، لەشێوەی یەك باڵندەدا بفڕن و ڕێگا بگرنە بەر.
گردبوونەوەی ئەم پەڕەسێلکانە، بەم شێوەیە سامێکی جوانی لای ئەم درووست کردبوو.. بە شانازییەوە بیری کردەوە و بەخۆی وت: ئەمانە چۆلەکە پاساری نین.
ئەوا ئێستا ئەم پەڕاسیلکانە، بە بەرچاوییەوە فڕین.. پاش ئەوەی چەند دەورەیەك لەشێوەی ماڵێ ئاواییدا بەسەر ئەو زەوییەدا سوڕانەوە، کە وەرزی

هاوینیان تێدا بەسەر برد.. ئەوسا بەهێمنیی و بە ئاسانیی بەرەو قولایی ئاسمان بەرزتر بوونەوە، لە دوورەوە لە پەڵەیەك ڕەشایی دەچوون، کە جاروبار تیشکی خۆر، وێنەی پەڵکە زێڕینەیەکی لێ دروست دەکرد.

شۆردون زۆر لە فڕینیان ورد بووەوە.. ئەوەتا چاوی لێیانە خەریکن دەورەیەکی تر دەکەن، دوا دەورەیەکی گەورە بەسەر باخە رووتەکانی پاییزەوە.. ڕیزی پۆلە پەڕەسێلکە دەتووت: هێڵێکە دەلەزرێ.. لەچەند شوێنێکی ڕیزەکەشدا هەندێ جێگاگۆڕکێ دەکرا، دوایی بۆ ڕێزەکانی خۆیان دەگەڕانەوە، ئینجا ڕیچکەی فڕینە گەورەکە لەبەر دەگیراو پۆلەکە وردە وردە دەبینران.. لەچاو گوم دەبوون، تا لەقولایی ئاسماندا تارماییان وەك دەنگدانەوەی گۆرانیەکی زۆر دوور دەڕەوییەوە.. بۆ شوێنە گومەکان دەفڕین..

کەچی ئەو بەیانییە پێش ئەوەی بفڕن، توانی بیانبینیێ، تێر گوێ لە زیقە زیقیان بگرێ.. دڵی دەتووت قوڵپی خەمێکی خۆشی تیدایە و وەك شەپۆڵێکی سەرخۆش هەر هەڵدەچێ.. هەردوو چاوی تەژی فرمێسك بوون، هیچ شتێکی تری بۆ نەدەبینرا، بەڵام هەر بۆ ئاسمانیشی دەنواڕی. لەگەڵیدا هەناسەیەکیشی هەڵکێشا، کە نەیزانی بۆ چییە.. بۆ شتێکی نزیك و خۆشەویست، کە بۆ هەتا هەتایی لێی گوم بووە.. ئەگەر تەمەنی کەمتر بوایە، لەوانە بوو گۆرانی ماڵئاوایی بڵێ...

خرمەی پێیەکی نزیك، (شۆردون)ی پیری بە ئاگا هێنایەوە، لە دوورەوە، لەسەر گردەکەی ئەوبەرەوە، زەلامێکی دی، سواری ئەسپێکی بۆشماخ بووە.. لەسەرەتادا نەیتوانی کابرا بناسێتەوە، دوایی کە نزیك بووەوە، زانی ئەمە (سابارالی)یە.. پیاوێکی پیرە، لەگوندەکەی ئەولایانەوە، ئەم هەردوو پیاوە پیرە، بەتەواوی یەکتریان ئەوەندە نەدەناسی.. یەکتر ناسینیان لەڕێگای هەندێ ڕێکەوتی شایی و (پرسە)ەوە بوو، دیاربوو (سابارالی)یش بۆ زیارەت دەچێت، چونکە پاڵتۆیەکی شەرابیی تازەی لەبەر کردبوو، شەپقەیەکی پێستەڕێوی لەسەر نابوو، دارێکیشی بەدەستەوەگرتبوو، کە ڕەنگی جێ دەستەکەی لە ڕەنگی چەولگە سوورەکانی ئەو کێوانە دەچوو..

(سابارالی) جلەوی ئەسپەکەی توند کردەوە، بەدەنگێکی سازگار، سڵاوێکی گەرمی لە (شۆردون) کردو پێی وت:

ـ ئەریٚ کابرای ئاسنگەر! ئەوەبیر لەچی دەکەیتەوە؟

ڕاست دەکات چونکە (شۆردون) ماوەیەك ئاسنگەر بوو.

(شۆردون) وەڵامی دایەوە:

ـ پەڕەسێلکە کۆچ دەکەن.

ـ چیی؟ پەڕەسێلکە کوان؟

ـ کۆچیان کرد.

ـ ئینجا با کۆچ بکەن.. ئەوە دار ـ ت دەبڕی؟.

ـ بەڵێ بۆ زستان. لەکوێوە دەڕۆیت؟.

زەردەخەنەیەك بەسەر ڕووی (سابارالی) دا بڵاو بووەوە، کە ڕیشێکی ڕەش دای پۆشیبوو، هێشتا سیمای گەنجێتیشی پێوە دیار بوو، وەڵامی دایەوە:

ـ دەچم سەرێك لە کوڕەکەم بدەم، کوڕەکەم لێپرسراوی کێڵگەی میرییە لە (ئەکسای)، لە سەر ئەو چیا مەزنە.

(سابارالی) بەدارەکەی دەستیی ئیشارەتێکی گەورەیشی ڕووەو چیاکە کرد.

(شۆردون)یش وەڵامی دایەوە:

ـ ناوی (ئەکسای)م بیستووە.. بەڵێ بیستوومە.

(سابارالی) وتی:

ـ من بۆ ئەویٚ دەچم.. کوڕەکەم نامەیەکی بۆ نووسیوم، تیایدا نووسیوە: با باوکم ڕۆژێ، دوو ڕۆژ سەرم لێ بدات..

دەگونجیٚ ئەم کوڕوکاڵانەش، سەرۆکایەتی بەدەستەوە بگرن، بەڵام بەبیٚ ئێمە هیچیان پیٚ ناکریٚ.. کوڕەزاکەشم ژن دەهێنیٚ، دەبیٚ تەدارەك بۆ ئەویش ئامادە بکەم، ئیٚ بێگومان میوانیشیان زۆر دەبیٚ، لەبەرئەوە بیر لە سازکردنی سواریی و غارغارێنیش دەکەمەوە.

(سابارالی) دەستی بە باسی کاروباری ئەو کێڵگە میرییە کرد، کە کوڕەکەی لێپرسراوێتی و ئێستا "خوری"یەکی زۆر بەرهەم دەهێنیٚ. شوانکارەکانیش

پارەیەکی باشیان لێ چنگ دەکەوێ.. خەڵکەکەش لە لێپرسراوی کێڵگەکەیان زۆر ڕازین.. دەنگیش وایە گوایە خەڵاتێك بەڕێوەیە بە کوڕەکەی (سابارالی) بدرێ.

ئەمانە هەمووی چاك بوون، بەڵام بیری شۆردون گۆڕا.. لەپڕێکدا هەستی کرد سۆزێکی کۆن، کە ساڵانێکی بێ دەنگ لە دڵیدا شاردبوویەوە، سەری هەڵدا، ئەو سۆزەی کە هەمیشە زیندوو بوو، سۆزێکی مناڵانەی وا، کە دەنگدانەوەی لەنێوان پەراسووەکانیدا جووڵەی دەهات، جووڵەیەکی وا، هەرکە پەڕەسێلکەی بدیایە کۆچ دەکەن، ئیتر ئەم، لای خۆیەوە، ئەو سۆزەی لە دڵیدا بوو، دەستی بە سەرە تاتکێ دەکرد، وەك بڵێسەیەکی ئاگر.. ئەو سۆزە سۆزی باوك و فرزەندیی بوو بۆ کوڕەکەی، ئەو کوڕەی ماوەیەکی زۆرە، ئەم جیهانەی بەجێ هێشتووە.. ئەویش ماوەیەك نزیك (ئەکسای) ئیشی دەکرد.. ئەویش دیسان جارێکیان جوابی بۆ باوکی ناردبوو بچێت سەرێکی لێ بدات، بۆیە بەبێئەوەی ئاگای لەخۆی بێت کە دەڵێت چی، تەکانی بۆ لای (سابارالی)دا و قسەکەی پێ بڕی. وەك وڕێنە بکات، بە پەرۆشەوە پێی وت:

ـ منیش کوڕەکەم بۆ ئەوێی بانگ کردم..

(سابارالی) لێی پرسی: "کوڕەکەی تۆش لەوێیە؟

" بەچرپە وتی: "بەڵێ" بەڵام لە حیرسیشدا دەلەرزی.

(سابارالی) بەساردێکەوە شانی هەڵتەکاند و وتی: "ئەمەم نەدەزانی، هەرچۆنێك بێت شتێکی باشە.. لەهەر شوێنێك هەن، خوا لەشیان ساغ کات.

(سابارالی) لەئەسپەکەی ژەند و ڕۆیشت. هەر بە ڕۆیشتنی (سابارالی)یش، (شۆردون) بۆ ناو خۆی گەڕایەوە، بێدەنگیی و چۆڵەوانیی، وەك هەورە بروسکە ڕایاندەوەشاند. بەخۆی وت: "چیم وت؟ درۆم کرد!".

(شۆردون) ڕاپەڕی و بەشوێن (سابارالی) دا ڕایکرد و هاواری دەکرد:

"بوەستە.. بوەستە. سابارالی"

بەشوێنیا ڕای دەکرد، تا داوای لێبوردنی لێ بکات، کە درۆی لەگەڵ کردووە.

(سابارالی) کەزانی شتێك هەیە، بەخۆی و ئەسپەکەیەوە لای کردەوە و پرسی.

ـ چی ڕوویداوە؟

(شۆردون) بە هەنسکەبڕکێ گەیشتە لای و دەیویست شتەکەی بۆ ڕوون بکاتەوە، بەڵام جارێکی تریش هەستی کرد بەرگەی ئەو هێزە ناگرێ، کە خۆی بە درۆ بخاتەوە. چونکە ئەم لای وابوو زیندوویەکە لەناو زیندوویاندا، کە زیندووش بوو، مەرج نییە هەر لەسەر زمانی شۆردون بێ، بەڵکو لای خەڵکی تریش، بۆیە نەیتوانی خۆی بەدرۆ بخاتەوە..

شۆردون هەرچەندی دەکرد دڵی نەدەهات بڵێ: چۆتە ژێر گڵەوە و لە فلان ڕۆژ و فلان جێگادا بووە. خۆی پێ قایل نە دەکرا بڵێ: کوڕەکەی دەمێکە مردووە و لە جەنگەکەدا کوژراوە. ئەم حەزی دەکرد، ئەگەر بۆ چەند دەقیقەیەکیش بووایە کوڕەکەی ماوەیەکی تریش بژی، ئینجا دوای ئەوە، لەکاتێکی تردا بیشی وتبایە مردووە، گرنگ نەبوو..

شۆردون پێی وت:

ـ ئەرێ جگەرەت پێ نییە؟ خەریکم بۆ جگەرە شێت دەبم.

سابارالی وەڵامی دایەوە:

"دەك بەڵام لێدایت شۆردون.. ترساندمت".

بەدەم هەناسە هەڵکێشانەوە کەوتە گەڕان بە گیرفانەکانیا و پێی وت:

ـ دەستت بکەرەوە. منیش وەك تۆ، بێ جگەرەیی پەکم دەخات..

لە شووشەیەکدا کەمێك تووتنی کردە لەپی دەستی (شۆردون)ەوە و پێی وت:

ـ ئەرێ کابرای ئاسنگەر، ئەوە بۆ دەستت دەلەرزێ؟ وادیارە پیری پێتەوە دیاری داوە!.

شۆردون وەڵامی دایەوە:

"بەڵێ منیش لەکاتی خۆیدا بەشی خۆم چەکوش وەشێنیم کردووە، بێگومان ناشتوانم بگەڕێمەوە تەمەنی لاوێتیی.. ببوورە لەوەی ڕاگیرم کردیت".

سابارالی وەڵامی دایەوە:

"نا. قەیناکە. ماڵئاوا.."

شۆردون پێی وت:

"هیوادارم سەفەرت سەلامەت بێ"

ئیتر بەبەریەوە نەمابوو سابارالی ڕابگرێ. (شۆردون)یش شادمان بوو بەوەی سابارالی بە گورجی تێی تەقاند و ئەمی تەنگەتاو نەکرد باسی مەرگی کوڕەکەی بکات.

کە سابارالی تێپەڕ بوو، شۆردون هەر بە پێوە وەستا بوو، لە غایلەی خۆیدا نقوم ببوو.. ئینجا دەستی پان کردەوە و توتنەکەی ڕۆ کردە سەر زەوی و بۆ لای عەرەبانەکەی گەڕایەوە.

بە لەشێکی گرانەوە کەوتە ڕێکردن.. لەبەر خۆیشیەوە هەر دەیووت: "چیم کرد؟ بێ شك من شێت بووم، ئینجا لەسەر ڕێگاکە وەستا و بەدەوری خۆیدا دەیڕوانی و بیری دەکردەوە.. تا چاو بڕیدە کرد سەیرێکی شوێن فڕینی پەڕەسێلکەکانی کردەوە، کە بەسەر ئەو هەردە بەرینەدا تێپەڕین.

بە چرپە بەخۆیشی وت: "نا.. نا.. من کوڕێکم هەیە.. زیندووشە..

ئینجا بە خەمگینی نەڕاندی:

من کوڕێکم هەیە.. هەیە.. دەشچم بۆ دیدەنی کوڕەکەم، چاویشم پێی دەکەوێ، دیدەنیشی دەکەم!

جارێکی تریش نوقمی بێدەنگیی بووەوە. بە درێژایی ئەو ڕێگایەی بۆ گوندەکە دەچوو، شۆردون دەیویست خۆی قایل بەوە بکات ئاوا دڵگیر نەبێت، چونکە ناتوانێ ڕابوردووی بۆ ئێستا بگێڕێتەوە.. بەڵام ئارەزووی بۆ سەردانی ئەو گوندە شاخاوییە، لە دەروونیدا وەك ئاگر گڵپەی سەندبوو.. دەبوایە هەر وای بکردایە چونکە ئەو ئاگرە لەمێژ بوو لەدڵیدا دەینالاند.. ساڵان و ساڵانێکی درێژ بوو، ئەمە وابوو..

دەمێك بوو بیری دەکردەوە و خەوی دەبینی، هەر خۆیشی، سەر لەو جێگایانە بدات، کە کوڕەکەی دوا ڕۆژانی پێش چوونە سەربازیی، تیایاندا بەسەر بردبوو، ئەوا ئەم چاو پێکەوتنەی (سابارالی)یش، ئەوەندەی تر ئاگری لە پووشوو بەردا.. ئەو ساڵانەش زۆر سەیر بەناو یەکدا چووبوون.. ئاوات و خەون بینینەکانیش ببوون بەڕاستی، لەبەرئەوەی شۆردوون وای دەهێنایە بەرچاوی خۆی، کە لەو دیدەنییەدا ڕوو دەدەن.. بێگومان کوڕەکەی بەو دیدەنییە گەشکە دەبێ و پێی دەڵێ: " بابە گیان ئەوە هاتیت! بەرەو ڕوویشی دێت.. باوکەکەیشی پێی دەڵێ:

"ئەی چۆن کوڕی خۆم.. تۆ چۆنیت! هیچ نەگۆڕاویت.. بەڵام من پیر بووم، دەتوانی خۆت بزانیت..

" کوڕەکەش پێی دەڵێ:

"نا، بابە گیان. تۆ بەو شێوەیە پیر نەبوویت.. تەنیا ئەوەندە هەیە، سەردەمێکی زۆر لێك دابڕاوین، ئەی بۆ هاتنت ئەوەندەی پێ چوو؟ چەند ساڵمان تێپەڕاند؟ بیست؟ لەوانەیە زیاتریش... ئەی بیرت نە دەکردم؟!.

"چۆن بیرم نەدەکردیت.. هەموو ڕۆژێکی ژیانم بیرم دەکردیت. بۆت پەرۆش بووم.. بمبوورە ئەگەر وام لێ کردیت بەمجۆرە چاوەڕوانیم بکەیت.. بەڵام خۆت دەزانیت ئیش و کاریشم زۆربووە.. تۆ خۆت دەزانیت دایکت مرد و ناشتمان.. ئیتر دوای ئەوەی تۆ لە جەنگدا کوژرایت، ئەو لەجێگادا کەوت و بۆ یەکجاریی هەڵنەسایەوە.. ئەوا منیش هاتووم بیرەوەریت زیندوو دەکەمەوە.. دەمەوێ ڕێزی زۆرم پێشکەش بەوانە بکەم لەگەڵ تۆدا ژیان.. ئەمەوێ ڕێزم پێشکەش بەو خاك و چیایە بکەم، بەو ئاو و هەوایەی هەڵت مژی و خواردتەوە.. کوڕی خۆم، من و تۆ یەکترمان دیتەوە.. بۆ وا لێم ورد دەبیتەوە؟ دە لەگەڵ خۆتدا بمبە، قوتابخانەکەتم نیشان بدە.. گوندە شاخاویەکەتم نیشان بدە. کە زۆرت بۆ باس دەکردم..".

شۆردون زۆر تەقەللای دا ناوی ئەو ڕاوچییەی بیر بکەوێتەوە، کە (سوڵتان)ی کوڕی لە ماڵەکەیاندا دەژیا، هەر ئەوەندەی لێ دەزانی پیاوێکی زۆر چاك بوو، (سوڵتان)یش زۆر لێی ڕازی بوو، بەڵام لەوانەیە ئێستا لە (٧٠)ساڵی نزیك بووبێتەوە، دەی دەبێ ئێستا مابێ؟ ئای. چەندین نامە بۆ شۆردون دەنووسێ، تا سەردانی بکات. میوانداریی بکات و پێکەوە هەڵۆ زێڕینەکەی بۆ ڕاو ببەن... ئای! ئاخۆ هەڵۆکە مابێ؟.. هەڵۆ لەو باڵندانەیە، کە زۆر دەژی، ئەوەیشی بیر کەوتەوە کە ڕاوچیەکە، کوڕێکی هەبوو، ساڵی یەکەمی قوتابخانە، (سوڵتان)ی کوڕی ئەم، دەرسی پێ دەووت.. بەڵام ساڵی دووەمی، ئیتر جەنگەکە دەستی پێکرد.. دەشێ ئێستا ئەو کوڕەی گەورە بووبێ و ژن و منداڵی هەبێ.. ژنی ڕاوچیەکەش هەر ئافرەتێکی چاك بوو.. سەرەڕای ئەوەش ئیش و کاری ڕۆژانەی لە کێڵگە میرییەکە

و لەماڵی خۆیشیان، ماندووی کردبوو، داواشی لە مێردەکەی کرد، دووان لەو سەگی ڕاوانە بۆ ماڵی باوکی بنێرێ، چونکە پێی نەدەکرا ئەو هەموو "تریت"ە بۆ ئەو هەموو سەگەلە بکات..

ڕۆژێکشیان (سوڵتان) سەگێکی ڕاوی هێنایەوە، ڕەنگی سپی بوو، هەندێ پەڵەی زەردیش بەلا تەنیشتەکانیەوە بوون.. ئای. چ سەگێك بوو.. مەگەر هەر لە چیا مەزنەکان لەمجۆرە سەگە هەبێ.. کە ڕای دەکرد، دەتوت هەورە بروسکەیە، ئەم جۆرە سەگانە بۆ ڕاوی بزنەکێوی بەکار دەهێنرا، کە ڕاویان بنێ، تا بیانکات بە تەڵەوە.. بەڵام بۆ ڕوژی دوایی (سوڵتان) سەگەکەی هێنایەوە و وتی: "خانە خوێیەکەم، زۆر دڵگیر دەبێ، چاکتر وایە لە (تریت) کردندا یارمەتی بدەم.. کە ڕۆیشت، سەگە چاکەکەش بەدوای پاسکیلەکەی (سوڵتان)دا ڕای کرد..

شۆردون بەجیابوونەوەی زۆر خەمبار بوو، بەڵام دەیزانی سەگ زۆر لە ڕاوچی تێدەگەن، ئەمیش هەموو ئەوکاتەی بە ئاسنگەریی بەسەر دەبرد.. ئەی تۆ بڵێیت ئەو سەگانەش هێشتا هەر ڕاوە ڕێوی بکەن، یان مردبن؟.

کاتێ شۆردون بیری لەم هەموو شتانە دەکردەوە، هۆیەکی بەجێی دۆزیەوە، کە زیاتر قایل بێ بە ڕۆیشتنەکەی.. بەڵێ دەچێ ئەو پیاوە ببینێ، ئەگەر ئەو پیاوە ڕاوچییەش مردبوو، ئەوا سەر لە گۆڕەکەی دەدات، خۆ ئەگەر زیندووش بوو، ئەوا دەچێ سوپاسی ئەوەی بکات، کە ئەو مناڵەی خۆی جوان پەروەردە کردبوو..

تەنیا شتێك هەبوو، کە شۆردون ڕێگای بەخۆی نەدەدا بیری لێ بکاتەوە، هەرچی کاتێکیش بیری بکەوتایەتەوە، ئیش و کاری ڕۆژانەی خۆی بەر چاوی خۆی دەهێنایەوە، تا بیری بچێتەوە.. بیری لە نرخی پەتاتە و لەوەڕی ئەو زستانە دەکردەوە، بیری لە چاکترین کات دەکردەوە بۆمەڕ سەربڕین و هێشتنەوەی ئاژەڵەکانی و فرۆشتنیان، دەیویست هەر بیری نەیەتەوە، چونکە پێشتر ئەو هەموو ساڵان و شەونخونییە و کاتی ئیش کردنی ئاسنگەرییە، ئەوەندەی بیری لێ کردبۆوە، لێی تێر ببوو.. ئەم شتە ئەوەندە خێرا و لەپڕ سەری لێ دەدا، وەك ئەوە وابوو چۆن چەکوشێك بەر دەزگایەکی ئاسن دەکەوێ،

یان ئاسنێکی سوورکراوە بە ئاوێکدا دەکرێ، بەڵام لای ئەم، شتەکە وا کەوتبووەوە، کە هەر خوا خۆی بڕیاری دەسەڵاتی ئەوەی هەیە، کە ئەم شتەی بۆ دەهێنێتە دی یا نا!.. خۆ ئەگەر دەسەڵاتی هەیە، ئەوا لەو دنیا بە کوڕەکەی شاد دەبێتەوەو هەموو لایەنەکانی مەسەلەکەی تێ دەگەیەنێ.. بەڵام داوای لێبوردنی لێناکات.. نا.. شۆردون، تا ئەو هەردوو کچەشی کە لە شار دادەنیشن، نەهاتنە دەنگ و ئەو هەموو ورتە و گلەییەیان نەکرد، پەشیمان نەبۆوە، بەڵکو هەروا بێدەنگ بوو، بەڵام هەردووکیان تا ئەمڕۆش سەبارەت بەو ڕووداوە سامناکە، لێی خۆش نەدەبوون..

ئەمە، ئەو ڕۆژە ڕوویدا کە (سوڵتان) بەرەو وێستگەی شەمەندەفەری شار دەچوو، بۆ بەشدار بوون لە جەنگدا.. لە ئەکتۆبەری ١٩٤١دا بوو، یەکێك بەڕاکردن خۆی بە دوکانەکەی شۆردون دا کرد و پێی وت:

"بەپەلە بچۆرەوە بۆ ماڵەوە، کوڕەکەت دەیەوێ ماڵئاواییت لێ بکات".

(شۆردون)یش هەروا بە پەلە، بە بەرۆکی ئاسنگەرییەوە گەڕایەوە و هێشتا دەنگی چەکوش و دەزگاکە لە گوێیدا دەزرینگایەوە، بەپەلە بە ڕێگادا دەڕۆیشت و باوەڕی بە شتەکە نەدەکرد.. ئەم لای وابوو کوڕەکەی هێشتا وەختی سەربازیی نەهاتووە.. بەڵام شتەکە ڕاست بوو.. چونکە (سولتان) بەسواری ئەسپێکی خواستراو لە مەڵبەندی ناوچەکەوە هاتبوو، تا دایکە نەخۆشەکەی ببینێ، کەساڵێك دەبوو نەخۆش کەوتبوو، بەبێئەوەی هیچ نیشانەیەکی چاك بوونەوەی لێ دیار بدات.. بۆیە داوای لەباوکیشی کردبوو، کەسەر لە شار بدات، تا لەئێسگەی شەمەندەفەر، چاوی پێی بکەوێ..

قسەکانی چاو پێکەوتنەکەیان زۆر پچڕ پچڕ و شێواو بوون. بەجۆرێ کاتێ لە ئێستگەش لە یەکتر جیابوونەوە، ماڵئاواییەکەیان ئەوەندە ڕێك و پێك نەبوو.. زۆر قسە و زۆر شت بیر چوون، تەنانەت هەندێ لەو شتانەش، کە لە سنگدا پەنگیان خواردۆتەوە، لەم جۆرە کاتانەدا ناکرێن..

شۆردون بەپەلە بەسواری ئەسپەکەی بۆ شار چوو. ئەو "٣٠" کیلۆمەترە ڕێگایەی زۆر گورج بڕی. کە گەیشت، ئەسپەکەی هەناسەی لێ بڕابوو.. ئەوەی

یەکەم شت سەرنجی (شۆردون)ی ڕاکێشا، ئەو ئاپوورەی جەماوەرە زۆرە بوو، کە لە پشت پەرژینی ئیستگەکەوە ڕاوەستا بوون، هەموو شتەکان لەوێ بوون: لۆری گەورە، کە ئالای سوور بەلا تەنیشتەکانیانەوە بوو، کۆمەڵی عەرەبانەی هەمەجۆریش، پڕ بوون لە ئالیك و دانەوێڵە، ئەسپی زینکراو، شەمەندەفەری هەڵم، لەسەر خەتی شەمەندەفەرەکە بۆڕە بۆڕیان بوو، عەرەبانەش هەر تەقە تەقیان بوو، سەرباری ئەمانەش، دانیشتووانی چەندان گوند و ناو شاریش ڕژابوونە ئەو ناوە ...

شۆردون دابەزی وئەسپەکەی بە یەکەمین عەرەبانەیەکەوە بەستەوە، کە لەناو ڕەوە ئەسپێکدا بوو، بەهەڵەداوان خۆی کوتا بۆ گەڕان بەدوای کوڕەکەیدا، بەر خەڵك دەکەوت و لێشی دەپرسین. پێیان دەوت: ئەو، لەناو تیپە سەربازییە ئامادە کراوەکاندایە، لە دەشتەکەی نزیك ئیستگەن، نایەڵن جیا ببنەوە و نایەڵن کەسیش تێکەڵیان ببێت، چونکە تاوێکی تر دەیانبەن..

شۆردون خۆی گەیاندە ئەوێ. لەوێش خەڵکی بەڕیز خۆیان بە پەرژینەکانەوە هەڵپەساردبوو، ئەو کاتەی ئەم گەیشتە ئەوێ، فەرمانیان پێ کرابوو مەشق بکەن.. "چەپ. ڕاست" یان دەکرد..

شۆردون بە شڵەژاویی وەستا، نەدەتوانرا ناسیاوت لەوێدا بدۆزیتەوە، لەبەرئەو هەموو درەختەو لەبەرئەوە کە ئەوانیش، لەو هەموو ڕیزەدا وەکو یەك بوون، لەپڕێکدا گوێی لە دەنگێك بوو بانگی دەکا:

" بابە.. بابە.... وەرە بۆ ئێرە.." هەردوو کچەکەی بوون لەبەر دەرکەی دەشتاییەکدا ئیشارەتیان بۆ دەکرد. دڕێ بە خەڵکەکەدا، تا بیانگاتێ.. بەدەم ڕێگاشەوە چاوی بە کوڕەکەی کەوت، لە دەشتەکەدا بوو، کوڕەکەیشی ئەمی بینی، بە زەردەخەنەوە دەستی بۆ هەڵتەکاند.. زەردەخەنەیەکی خێراو سەیر..

شۆردون بەزەیی بە کوڕەکەیدا هاتەوە.. ئەوەندە منالێ بوو، هێشتا ڕیشی دەرنەهاتبوو، لەوان نەدەچوو، مەگەر بە بالا، ئەگینا شانەکانی و دەم و چاوی، سیمای منداڵییان تیدا دەبینرا.. دیارە بەم دوو ساڵەی دوایی، کە سەربازیی تێدا دەکات، دەبێ بە پیاوێکی تەواو و تۆکمە و پەل ئەستوور.

پاش ئەوەی شوردون بیری لە کوڕەکەی دەکردەوە. جیاوازییەکی تایبەتی لە کوڕەکەیدا بەدی نەدەکرد، ئەم خۆی حەزی دەکرد ڕێزگرتن فێربێ. نەك بەتەنیا خۆشەویستی، هەموو کەسێ خەڵکی خۆش دەوێ، بەڵام ئەم هەر لە منداڵیەوە زۆر ڕێزی کوڕەکەی خۆی دەگرت، وەك ئەوەی مرۆڤێکی ژیرە، ئەویش بە پێچەوانەوە بوو، سەرەڕای ئەوەی کە هێشتا منداڵ بوو، شەیتانیش بوو..

شۆردون لەم ڕووەوە نەیدەزانی مەسەلەکە چۆن لێك بداتەوە، بەڵام ئەم لەگەڵ کوڕەکەیدا بەمجۆرەبوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە کوڕەکەی بوو بە مامۆستا، شۆردون هەر بەچاوی ڕێزەوە بۆی دەڕوانی، گوێی لە بیرو ڕایەکانیشی دەگرت، هەرکاتێکیش کە بۆ ماڵەوە دەگەڕایەوە، بۆیمباخێکی سووری دیدەوانیی لەمل دەکرد، چونکە لە قوتابخانە لێپرسراوی هەرەوەزکاری دیدەوانەکان بوو ، هێشتا ڕەگی سەرکیشیی و سەرەڕۆییشی تیدا مابوو، بەڵام شۆردون لای وابوو ڕۆژێك هەر دەبێ بگەڕێتەوەو ببێت بە پیاوێکی سەنگین. لەبەرئەوە وای بەچاك دەزانی دەست نەخاتە کاروباری خەڵکەوە و بە ئامۆژگاریی ماندوویان نەکات، چونکە دەیزانی لە داهاتوودا کوڕەکەی ڕێگای خۆی دەدۆزێتەوە، لەوانەیە هەرئەمەش بووبێتە هۆی هەڵپڕژانی بە کچەکانیدا، کچەکانی: گەورەکەیان "زیبتیش"و بچووکەکەیان "سالیکا"، هەر لە شار قوتابخانەیان تەواو کرد و هەر لەوێش شوویان کردبوو.. (سولتان)یشیان بردبووە لای خۆیان و لەوێ چووبووە خانەی مامۆستایان و ئەوا ئێستا سالێکە مامۆستایە...

شۆردون کە گەیشتە لای کچەکانی، وەك هۆیەك هەبێ، دەستیان گرت و لە ئاپوورەکە دووریان خستەوە، بەڕقیشەوە بە ئەسپایی دەستیان بە جوێندانی براکەیان کرد.. لەسەرئەوەی لاوێکی سەرگەرمە و خۆی، خۆی ناونووس کردووە، بۆ هەرکوێش دەچوون، ئاپوورەکە چڕتر دەبوو، کچەکانی زۆر تووڕە و هەڵچووبوون، بۆیە لەو گۆڕەپان و لەناو ئەوئاپوورەیەدا ئەم مشت و مڕەیان بوو:

ـ دەزانی کوڕەکەت، خۆی، خۆی ناونووس کردووە؟

شۆردون وتی: "نەء.. چی تر؟!"

ـ پێوەندیمان بە سەربازگەی ناوچەکە و فەرماندەی سەربازییەوە کرد، خۆی دەیەوێ، ئەو خۆی داوای چوونی کردووە و خۆی دەیەوێ بۆ شەڕی بینێرن... تێ دەگەیت؟.

ـ ئەمە مانای وایە، هەستی کردووە، پێویستە ئەمە بکات...

ئیتر کچەکانی شالاویان بۆ هێنا و بەسەریدا ڕووخان:

ـ پێویستی کردووە؟ بابە. تۆ ناتەوێ تێ بگەی؟ ئێمە مێردەکانیشمان لەوێن، ئەوان بەس بوون، کێ دەزانێ ئەوانیش دەگەڕێنەوە، یان دەکوژرێن! ماومانە لەمەش بێکەستر بین..! ئەوە ئەویش، دوا کەس بوو لەخێزانەکەماندا.. خۆی سنگ دەباتە پێشەوە بۆ ناو جەنگەکە..

ـ لەوێ وەك جووجەڵە دۆش دادەمێنێ، وا دەزانێ مەسەلەی جەنگیش، وەك سەرکردایەتی کردنی دیدەوانی وایە..

ـ بابە، تۆ هیچ قسەیەکت نییە؟.

شۆردون وەڵامی دایەوە:

"ئەی من دەتوانم چی بڵێم و چیم پێ دەکرێ؟".

ـ بچۆرە لای.. ئێستا داوایان لێ دەکەین ڕێت بدەن بچیتە لای.. بچۆ پێی بڵێ با پەشیمان بێتەوە... بچۆ، قایلی بکە، تا لەدەستمان نەچووە.

ـ وای لێ بکە بیری بگۆڕێ، تێی بگەیەنە ماوەیەکی تر، کە سەرەی سەربازی خۆی هات، بۆی هەیە ببێت بە سەرباز.. تۆ تەنیا کەسیت بتوانیت پەشیمانی بکەیتەوە.

شۆردون ورتە ورتێکی کرد:

"تا دەقیقەیەك چاوەڕێ بکەن"

شتەکە لەم کاتانەدا زۆر گران بوو.. چۆن لە کچەکانی بگەیەنێ کە لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا، داخوازییەك لەمجۆرە لە پیاوێك داوا بکەیت! ئەی کوڕەکە خۆی، چۆن دەتوانێ لەقسەی خۆی پەشیمان بێتەوە! ئەوسا چۆن لەڕووی دێت لەڕووی ئەوانەدا سەر هەڵبڕێ، کە لەگەڵیدا وەستاون! ئەی خەڵکی چی پێ دەڵێن؟. ئەی خۆی، ڕای لەخۆی چی دەبێ؟.

شۆردون وتی:
"بڕوا ناکەم بتوانرێ شتێکی وا بکرێ.. ئەمە مایەی شەرمەزاری دەبێ بۆ ئەو.."
ـ ئەمە عەیبی لەکوێ تیایە؟.
ـ ئەمە ئیشی کێیە..؟ کێ لێرە دەتناسێت؟ کێ ئاگای لێ دەبێت کە تۆ قسەی لەگەڵ دەکەیت؟.
شۆردون بەخۆ گرژ کردنەوە وتی:
"ئەو خۆی دەزانێت، خۆی بنچینەی هەموو شتێکە..".
ـ ئەی.. بەسێتی بابە ئیتر.. ئەو هێشتا منالە.. بڕۆ.. بڕۆ تا لەدەستمان نەچووە..
لەو کاتەدا غەڵبە غەڵب و جموجۆڵی خەڵکەکە دەستی پێکرد، تیپێکی مۆسیقاش دەستیان بە مۆسیقا ژەندن کرد، ئالایەکی سووریش هەڵکرا.. لەدەرگای دەشتەکەشەوە دەستەیەك سەرباز دەرکەوتن و ئاهەنگ دەستی پێکرد.. کچەکان دەستی (شۆردون)یان گرت و پاڵیان پێوە دەناو دەنگیشیان لەناو ئەو هەموو ژاوە ژاو و مۆسیقایەدا بەرز دەبۆوە:
ـ بەپەلە.. با بچین بۆ لای لێپرسراوی خەتی شەمەندەفەر، لە ئێسگەکەیە، دەبێ کوڕەکەت ڕزگار بکەیت..
ـ بابە، بابڕۆین، هەر لەبەر خاتری ئەو دایکە نەخۆشەی، بە لێپرسراوی خەتەکە بڵێ: دایکی نەخۆشە، پێی بڵێ دایکی گیان دەدات، خەریکە دەمرێ..
شۆردون لەبەرامبەر ئەم قسانەدا هەروا بە دوودڵی ڕامابوو.. کچەکانی بەناو خەڵکەکەدا بۆ ماڵئاوایی هاتبوون، پەلی باوکیان بۆ لای لێپرسراوی خەتەکە بەکێش کرد.
ئێستگەکە، بەبەرزی پلیکانەیەکی بەردین. بەسەر دەشتەکەدا دەیڕوانی، سەر و ژێریشی پڕ ببوو لە خەڵك، کەچی سەرباری ئەو قەرەباڵغیەش، کەهەموویان لە عارەقدا شەلاڵ ببوون، کچەکان دەستی باوکیان گرتبوو، بەرەو سەرەوە ڕایان دەکێشا.. بەناو سەدان چاوی پڕ خەم و فرمێسك و ئازایەتی و نائومێدی و ماڵئاواییدا

تێپەڕین.. بەناو هاواری ماڵئاوایی و بەڕێکردنی سەربازەکانی ناو دەشتاییەکەدا تێپەڕین.. بەناو ئازاری شۆڕدون خۆی و نرکەی دڵە بەستراوەکەیدا تێپەڕین..

هەرچەندە شۆردون دەیزانی ئەم کچانە، لەچاکە زیاتر هیچ شتێکی تریان بۆ براکەیان ناوێ و لەو چاکتر بۆ خێزانەکەیان کەسی تر نییە و بەشێوەیەکی تایبەتی، خۆیان ئاسایی خۆشیان دەوێ و دەیپارێزن... بەڵام هەستی بە بێزاریی و تووڕە بوونێك كرد بەرامبەرکچەکانی، کە وردە وردە لەدڵیدا گەورەتر دەبوو، کاتێ پەلیان ڕادەکێشا و داوایان لێ دەکرد کوڕەکەی بگێڕێتە دواوە و هەموو شتێك بخاتە ئەولاوە و ڕێزی خۆی نەهێڵێ.. ئەم هەستە تا دەهات گەورەتر دەبوو.. بەتایبەتی کاتێ بەسەر پلیکانەکەدا ڕایان دەکێشا و دڕیان بە ئاپوورەکە دەدا..

شۆردون لەسەر دوا پلەی پلیکانەکە، تیپە سەربازەکەی دی.. ئەو تیپەی کە کوڕەکەی تیایدا دەڕۆیشت.. تیپەکە لەسەر ئاوازی مۆسیقایەك ڕێی دەکرد و دوا کۆمەڵ بوون، کە خەریك بوون سواری شەمەندەفەرەکە دەبوون..

(سولتان) لەڕێزی دواوە بوو، شۆردون یەکسەر ناسییەوە.. هەستی کرد سەیری ئەملاوئەولای خۆی دەکات و چاو بۆ باوك و خوشکەکانی دەگێڕێ...

ئای، لەم کاتەدا ئەگەر بیزانیایە باوکی پاڵ بە خەڵکەوە دەنێ تا بگاتە لێپرسراوی خەتەکە و تکای لێ دەکات (سوڵتان) لەسەربازی دەربێنێی و ڕسوای دەکات و شان و شکۆی دەشکێنێ...!!!..

شۆردون چاوی لێ بوو کچێکیش بە بەرگی سوورەوە، بەناو خەڵکەکەدا تەکان دەدات، تا گەیشتە ناو باوەشی (سوڵتان)، کەچی هەر بە پەلە لەدەست گوشین زیاتر نەیانهێشت لەگەڵیدا بمێنێتەوە.. کە ئەمانیش گەیشتنە بەر دەرگای لێپرسراوی خەتەکە، کچەکانی کەوتنە پاڵ پێوەنانی و پێیان دەوت:

"دەبڕۆ.. دەبچۆ خێراکە.. پێی بڵێ من باوکیم، هەواڵی دایکیشی بەرێ، پێی بڵێ (سوڵتان) نافامێ و هێشتا منداڵە.. پێی بڵێ سواری شەمەندەفەرەکەی نەکەن.. هەموو شتێکیان تێ بگەیەنە.."

ـ بابە. دەبڕۆ. خێراکە. چی ڕێی لێ گرتوویت؟ هەموو دەقیقەیەکی ئێستا، بۆ ئێمە زۆر بەنرخە..

شۆردون بەرامبەر بەو خەڵکە زۆر هەستی بە شەرمەزاری کرد، هەرچەندە هیچیان ئاگایان لەم نەبوو.. هەموو سەرباز و خەڵکەکەش، هەریەکە سەرقاڵ و دڵی لای ئیشی خۆی بوو..

شۆردون بەدەم ڕەتکردنەوەی پاڵنانی کچەکانیەوە وتی:

"من فێر نەبووم ئەمجۆرە ئیشانە بکەم.. ناچم.."

ـ نا.. دەبێ بچیت.

ـ ئەگەر تۆ نەچیت. ئێمە دەچین.. ئێمە ئیشەکە جێبەجێ دەکەین..

ئیتر کچەکان گەیشتە تینیان، هەڵمەتیان بۆ دەرگای لێپرسراوی خەتەکە برد، شۆردون باڵی هەردووکیانی گرت و بەدەم ڕاکێشانەوە پێی وتن:

ـ "ناتوانن.. نابێ بچن.."

هەتا هێزیشی تیابوو لەسەر پلیکانەکانەوە خستنیە ناو ئاپوورەی جەماوەرەکەی خوارەوە. ئەوانیش لەداخا، چی بۆ نێوان باوك و مناڵ نەدەشیا بووترێ، پییان وت:

ـ تۆ پاڵ بە کوڕی خۆتەوە دەنێیت بۆ مردن...

ـ بە نەحلەت بیت، تۆ باوکی ئێمە نیت.

کچە بچووکەکەشیان چاوی لە گەورەکە کرد: "ڕاست دەکات تۆ باوکی ئێمە نیت"

دەم و چاوی شۆردون زەرد هەڵگەڕا. لەسەرخۆ خۆی شل کرد و قۆڵی بەردان... بەهێواشێکەوە لای بۆ ناو ئاپوورەکە کردەوە. دەستی بە پاڵنانی خەڵك کرد.. پەلەی بوو دەیویست ماڵئاوایی لە کوڕەکەی بکات.. دڕی بەو دارستانە چڕە دەدا، کە بەقیژ و ژاوە ژاو، لەسەر شۆستەی ئیستگەکە بۆ ماڵئاوایی وەستابوون، لەوانەی سواری شەمەندەفەر دەکران، بەڵام ڕێگاکە ئەوەندە سیخناخ بوو، جێی ئەوە نەبوو کەس پێی بنێتە زەوی. مۆسیقاکەش هەر دەژەندرا...

شۆردون خۆی بە پەرژینی شۆستەکەوە نووساند و سەرنجی ئەو زەریا خەڵکە و ئەو فارغۆنە سوورەی دەدا، کە بەیەکەوە بەسترابوون و شەمەندەفەرێکی بێ کۆتاییان دروست کردبوو.. بەدەم دەست هەڵبڕینەوە لەمدیو پەرژینەکەوە بانگی کرد:

"سوڵتان.. سوڵتان.. کوڕی خۆم! لێرەم گوێت لێمە..؟"

بەڵام هاواری ئاراستەی کوێ بکردایە!

یەکێك لە کرێکارەکانی شەمەندەفەرەکە لەپاڵ پەرژینەکەدا وەستابوو، لێی پرسی: "ئەسپت پێیە؟"

شۆردون وەڵامی دایەوە: "بەڵێ"

ـ دەزانیت شەمەندەفەرەکان لەکوێدا ئاڵوگۆڕ دەکرێن؟

ـ دەزانم.. لەو لایەوە..

ـ کەواتە گوێ بگرە! سواری ئەسپەکەت بەو بچۆ بۆ ئەوێ.. لەوێ وەختت زۆرتر دەبێ، هەر تەنیا (٥) کیلۆمەترێکیش لێرەوە دوورە، لەوێ شەمەندەفەرەکە کەمێك دەوەستێ، ئەوسا لەوێ دەتوانیت چاوت بە کوڕەکەت بکەوێ و خوا حافیزی لێ بکەیت.. دەخێرا بڕۆ، با بیگەتێ..

شۆردون بە پەلە بە دەوری گۆڕەپانەکەدا سوڕایەوە ئەسپەکەی دییەوە، هیچی بیر نەمابوو لەوە زیاتر کە گرێی جڵەوەکەی یەکسەر بۆ کرایەوە، قاچی بە ئاو زەنگیەکاندا کرد و لا تەنیشتەکانی ئەسپەکەی بە قامچی سوور کردەوە، خۆی بەسەر ملی ئەسپەکەدا چەماندەوە و بەتەریبی خەتی شەمەندەفەرەکەدا تێی تەقاند.. بەو ڕێگا چۆڵانەدا باڵی گرت، کە تاك و تەرا خەڵکی پیادە و سوارەی پێدا دەڕۆیشتن و فڕکەی ئەم دەیترساندن.. دەتووت قەرەجێکی کێوی دڕندەیە.. هەر بیریشی دەکردەوە:

ئەگەر فریای بکەوم، دەبێ زۆر شت هەیە، بە کوڕەکەمی بڵێم..

بێئەوەش ماسولکەکانی چەناگەی خاو بکاتەوە، دەستی بە نوێژ و دوعای سواریی کرد:

"ئەی ڕوحیانەتی باپیرانم! یارمەتیم بدەن، تۆش ئەی (کامبار ئاتا)ی پارێزەری ئەسپ، یارمەتیم بدە.. پەلی ئەسپەکەم بەهێز بکەن، باڵی هەڵۆ و دڵی شێر و قاچی ئاسکی پێ ببەخشن"

شۆردون له شەقامەکه دوور کەوتەوه و ڕێگاکەی قەدبڕ کرد.. که گەیشته ئەو دەشتاییەی شەمەندەفەرەکانی تیدا ئاڵوگۆڕ دەکرێن، لەپشت خۆیەوه گوێی له دەنگی شەمەندەفەرەکه بوو.. که هەردوو شەمەندەفەرەکەش ئاڵوگۆڕ کران، دەنگی ئەو ئاڵوگۆڕ کردنه، ئەوەنده بەسەر شانه نوشتاوەکانییەوه قورس بوو، دەتوت هەرەسی کێوێکی بەفرینه.

لەو کاتەدا که ئەسپەکەی شۆردون خەریك بوو ماندوو دەبوو، شەمەندەفەرەکەی لێ نزیك بووەوه، بەڵام ئەم هەستی کرد ئەگەر شەمەندەفەرەکه بوەستێ، دەیگاتێ، چونکه دەشتی ئیستگەکه زۆر نزیك بوو.. ترس و پەژارەی نەوەستانی شەمەندەفەرەکەش، لەبەر هەر هۆیەك بوو، وای لێ کرد خوای بیر بکەوێتەوه:

"ئەی خوای گەورە، ئەو شەمەندەفەره بوەستێنه، تکات لێ دەکەم بیوەستێنه.. ئەو شەمەندەفەره بوەستێنه".

کاتێ شۆردون گەیشته فارغۆنەکانی دواوەی شەمەندەفەرەکە، شەمەندەفەرەکه وەستا، کوڕەکەیشی بەدرێژیی شەمەندەفەرەکه بەرەو ڕووی ئەم ڕای دەکرد..

شۆردون هەرکه چاوی پێ کەوت، له ئەسپەکەی دابەزی، هەردووکیان بەبێ نقه باوەشیان بەیەکدا کرد.. لەوێدا هەردووکیان بەبێ گوێدانه هیچ شتێکی ئەم دونیایه وەستان.

ئینجا (سولتان) پێی وت:

"بابه گیان. بمبووره لەوەی خۆم، خۆم ناونووس کردووه".

ـ دەزانم کوڕی خۆم..

ـ بابه. وابزانم خوشکەکانیشمم تووڕه کردووه، حەز دەکەم ئەگەر توانیت دڵیان بدەرەوه..

ـ ئەوان لێت دەبوورن ئەگەر تۆ لێیان دڵگیر نەبیت... لەبیریان مەکه و نامەشیان بۆ بنووسه. گوێت لێمه؟ دایکیشت لەیاد مەکه..

ـ بیرم ناچن بابه گیان..

ئیتر لە ئیستگەوە دەنگی زەنگێکی بێزارکەر، بەرز بۆوە، کە نیشانەی ماڵئاوایی و دەست لێك بەردان بوو.. باوکەکە بۆ یەکەمجار لەدەم و چاوی کوڕەکەی ورد بۆوە.. هەر کە تێی ڕوانی، دەم و چاوی خۆی تێدا بینی.. خۆی تێدا دی، کە تازە لە هەڕەتی لاویدایە.. توند کوڕەکەی بە سنگیەوە نووساندەوە، هەر ئەو کاتە هەستی کرد ئازار لە هەموو لەشیەوە سەر هەڵدەدا و دەیەوێ خۆشەویستیی باوکێتی بۆ لەشی کوڕەکەی بگوازێتەوە..

شۆردون بەدەم ماچ کردنی کوڕەکەیەوە پێی دەوت:

"کوڕی خۆم پیاو بە.. لەهەر جێیەك بوویت، دەبێ پیاو بیت.. هەمیشەش هەر پیاو بە..".

فارغۆنەکان بزوتن، ئەفسەرە لێپرسراوەکە بانگی کرد:

"سولتان. ئەوا ڕۆیشتین..".

کە (سولتان)یان بەرەو شەمەندەفەرەکە ڕاکێشا.. شۆردون باڵەکانی لێ شل کرد، لای کردەوە تا دەم و چاوی لە سنگە گەرمە عارەق ڕێژەکەی ئەسپەکەیدا بشارێتەوە.. دەستی بە گریان کرد.. هەردوو باڵی کردبوو بە ملی ئەسپەکەداو هەنسك وا ڕایدەژەند، کە ئەسپەکەی قورس کردبوو، ناچار ئەسپەکە قاچەو قاچی دەکرد..

کرێکارەکانی ئیستگەش بە هێمنی تێپەڕین.. دەیانزانی ئەم خەڵکە لەم ڕۆژانەدا بۆ دەگرین.. ئەو منداڵانەش کە لەدەور و پشتی ئیستگەکە، یارییان دەکرد، لەپڕ بێدەنگ بوون، بە چاوێکی سۆز و منداڵانەی پاکەوە، سەیری ئەو پیاوە پیرەیان دەکرد..

خۆر، بە بەرزی دوو باڵا چنار لەسەر لووتکەی چیاکان بەرز بووبۆوە، کاتێ کە شۆردون بەناو (گۆرج)ی بچوکدا تێپەڕی، بەو هەردەدا ڕێی گرتە بەر، کە لە دۆڵێکەوە بەرەو بناری چیا بەفرینەکان دەچوو.. لێدانی دڵیشی خێراتر لێی دەدا.. کوڕەکەی لەسەر ئا ئەم خاکە دەژیا.

# گوتوبێژی مێژوویی ناپلیۆن بۆناپارت

# و

# گۆته

سیمای فەرهەنگی مەزنی میللەتێكی لاواز و لەبەریەك هەڵوەشاو لە بەرامبەر ڕابەرێكی سیاسی و سوپایی دەوڵەتێكی بەدەسەڵات و سەركەوتوودا

نیوەڕۆی دوومین ڕۆژی ئۆكتۆبەری ساڵی ١٨٠٨ز – بوو، كە ئیمپراتۆری فەرەنسە: ناپلیۆن بۆناپارت، لە لووتكەی دەسەڵات و درەوشانەوەیدا، لە (ئێرفۆرت)[1] دیدەنی (ڤۆلڤانگ گۆتە)ی ئەڵمانی كرد، كەیەكێكە لە مەزنترین سیمای فەرهەنگی جیهان... ناپلیۆن خۆی بەشوێن (گۆتە)دا ناردبووی و لە كۆڕێكدا كە هەموویان بە پێوە وەستابوون، چەندان كەسی بەناوبانگی تێدا بەشدار بوون، وەك: (تالیران)ی وەزیری

(1) :Erfurt شارێكی پیشە سازیی خۆرهەڵاتی ئاڵمانیایە. ساڵی ١٨٠٨ز – تیایدا ناپلیۆن بۆناپارت ئیمپراتۆری بەناوبانگی فەرەنسە، دیدارێكی لەگەڵ ئەلیكساندەری یەكەم – تزاری ڕووسیادا ساز كرد، كە چەندان فەرمانڕەوای تری ئەوروپا تیایدا بەشدار بوون. بەڵام سەرەڕای ئەمەش ئەو دیدەنی و پەیماننامەنەی لێرەدا هاتنە گۆڕێ، نەبوونە ڕێگری پێنجەمین بەرە، دژی ناپلیۆن .

دەرەوە و سیاسەتمەداری کۆنەکاری فەرەنسە و (کۆنت دارو)ی[2] مێژوونووس و کارگێڕی (سوپای گەورە)ی ناپلیۆن و مارشاڵ (سۆڵت)ی[3] یەکێك لەوانەی لە نەبەردەکانی (ئەسترلیتز)دا، بە سەرکەوتوویی بەشدارییان کردووە و فەرماندەی هێزەکانی فەرەنسە، لە (ئیسپانیا)دا...

بەڵام لەمانەش گرنگتر ڕووبەڕووبوونەوەی ئەفسانە ئاسای دوو کەسایەتی مەزنی مێژوویی، واتە: گۆتە و ناپلیۆن بووە، کە بەسەرنجی ستایش ئامێزی یەکترەوە، لە یەکدی ورد دەبوونەوە و بەمتمانە بەخۆ و دەسەڵاتی هاوسەنگ و بەرامبەرەوە، دەپەیڤین.

**ناپلیۆن** ـی ئیمپراتۆر بە تەنیا لەسەر مێزی نانخواردنەکەی خۆی دانیشتبوو و پچڕ پچڕ لەگەڵ گۆتەدا دەدوا و گۆتەی نووسەری بەناوبانگی ئەڵمانیاش لە ژێر زەبری کەسایەتی سەرسوڕهێنەر و ناوبانگی جیهان داگری بەرامبەرەکەی خۆیدا، بەشێوەیەکی ڕێزئامێز، لە ڕوویدا قیت و قنج وەستابوو... لە ڕاستیدا بۆناپارت ئاگادارییەکی قووڵی لەبارەی ئەدەبیاتی ئەڵمانیاوە نەبوو. ڕەنگە لە قووڵایی دڵیشیەوە (کریستۆڤ ڤیلاند)ی[1] لە (گۆتە) زۆر باڵاتر دانابێ — هەرچەندە کە جارجارە ئەمەی بەرواڵەت بە پێچەوانەوە دەنواند.

ئەو دەقەی کە لە خوارەوە دەیخوێنیتەوە، ڕاپۆتێکی وردی ئەم دیدەنییە مێژووییەیە، کە بە قەڵەمی کەسێکی ناودارو شایەتێکی دیدارەکە، واتە: (تالیران)ە،[2] کە خۆی لەوێ بووە و ئەم نووسینەی ئامادە کردووە.

---

(2) Daru.

(3) Soult.

(1) :Christoph Wieland نووسەر و شاعیری ئاڵمان ـ ١٧٣٣ز ـ ١٨١٣ز، کە بە شیعر و وتار و کورتە چیرۆکەکانی. کارێکی زۆری لە سەر هەستی (گۆتە) کردووە .

(2) – Talleyrand شارل موریس دو — ١٧٥٤ز — ١٨٣٨ز — سیاسەتمەدار و دەوڵەتداری فەرەنسە، کە تا ساڵی ١٧٨٨ز — قەشەی کە نیسای کاتولیك بوو. ساڵی ١٧٨٩ز — بووە نوێنەری ئەنجوومەنی دامەزرێنەرانی شۆڕشی گەورەی فەرەنسە. ساڵی ١٧٩٣ز — تا ١٧٩٦ز — بۆ ئینگلستان و فەڕەنسە هەڵات و دوایی بۆ فەڕەنسە گەڕایەوە و بووە وەزیری دەرەوە. سەرباری ئاڵ و گۆڕی بەردەوامیش لە ڕژێمی دەوڵەتدا، تا کۆتایی سەردەمی ئیمپڕاتۆرێتی ناپلیۆن بۆنا پارت، هەر سیاسەتی دەرەوەی

* * *

**ناپلیۆن**: جەنابی گۆتە، کاتێکی خۆشە، کە ئێوەی تێدا دەبینم. دەزانم کەسێکی هەڵکەوتەیت.

**گۆتە**: قوربان، وەك دەیبینم ئەو کاتانەی کە خاوەن شکۆ لە سەفەریشدان، شتە بچووکەکان هەر بەسەر دەکاتەوە.

**ناپلیۆن**: دەزانم جەنابت سەرباشقەی شاعیرانی شیننامەگێڕی ئەڵمانیایت.

گۆتە: گەورەم سەبارەت وڵاتی ئێمە، بێ ئینسافی دەفەرموون. بەلای خۆمانەوە، ئێمەش پیاوگەلی مەزنی تایبەت بە خۆمانمان هەیە، وەك: شیللەر،[٣] لسینگ و[٤] ڤیلاند، دەشێ جەنابتان بیانناسن.

**ناپلیۆن**: دانی پیادەنێم کە ئەوانە هەر ناناسم. سەرەڕای ئەمەش (جەنگی سیی ساڵە)م[٥] خوێندۆتەوە. ئەگەریش پێیان ناخۆش نەبێ، بەلای منەوە شتێکی

---

فەڕەنسەی ڕێنوێنی دەکرد. لەدوای ڕوخانی ناپلیۆنیش، لە ڕژێمەکانی بەرودوادا، چەندان جار بۆتەوە بە وەزیری دەرەوە و تەنانەت بەناونیشانی سەرۆکی دەوڵەتیش هەڵبژێردراوە.

(3) schiller – 1759 ز – ١٨٠٥ز – نووسەر و شانۆ نامە نووسی مێژوویی ئەڵمان و سەرباشقەی شیعری غەزەلیات و بەتایبەتیش (سرودی شادی)یە، کە بیتهۆڤن لە دوایین بەشی سیمفۆنیای نۆیەمی خۆیدا، کەڵکی لێ وەرگرت. شانۆ نامەکانی (شیللەر)، نموونەی جۆرێك تەبایی نێوان شێوەننامەی کلاسیکی یۆنانی و شانۆ نامەکانی شکسپیرە.

(4) Lessing1739 - ز – ١٧٨١ز – نووسەری ئەڵمانە، کە لە ڕەخنەکانیدا، لاسییەکانی شانۆ نامە گەلی فەڕەنسا دەکاتەوە و بەدەم ستایشی شکسپیریشەوە، ئەو شانۆ نامە فەلسەفەییانەی نووسی. جۆرە جوانکاریەکی شانۆیی هێنایە ئاراوە .

وای تێدا نابینم، ئەوە نەبێ کە شیوەننامەگەلێکی بازارِیانەیە و هەر شیاوی ئەوەیە لە ناو شانۆگەلی سەر بلوارەکانی ئێمە، بتوانن ئیلهامیان لێ وەربگرن.

**گۆتە**: خاوەن شکۆ، من بلوارەکانی ئێوەم نەدیون. بەڵام پێم وایە کە شانۆنامەگەلی تایبەت بە خەڵکی رەشۆکییانەیان تێدا دەنوێنرێت. لە راستیشدا پێم ناخۆشە ئێوە ئاوا، کەیەکێك لە بەجۆشترین بلیمەتەکانی سەردەمی نۆی، بەکەم دەگرن.

**ناپلیۆن**: جەنابتان زۆرتر هەر لە (وایمار)[1] نیشتەجێن. ئاخۆ ئەوێ بۆتە مەڵبەندی خرِ بوونەوەی ئەدیبان و وتاربێژانی ئەڵمانیا؟.

**گوتە**: جەناب، لەوێ ئەدیبان و هونەرمەندان پیشتیوانی چاکیان هەیە، بەڵام ئێستا، جگە لە (ڤیلاند)، کەسایەتییەکی تری رووناکبیریمان لە (وایمار)دا نییە، کە لەسەرتاسەری ئەوروپادا ناسراوبێت، چونکە (مولێر)[2] خۆی هەر لە (بەرلین) نیشتەجێیە.

**ناپلیۆن**: من پێم ناخۆش نییە (ڤیلاند) ببینم.

**گۆتە**: ئەگەر خاوەن شکۆ دەفەرموون، بانگی دەکەم. دڵنیام بەپەلە خۆی دەگەیەنێتە ئێرە.

**ناپلیۆن**: ئاخۆ ئاشنایی لەگەڵ زمانی فەرەنساییدا هەیە؟.

**گۆتە**: بەڵێ. قوربان. هەندێ لە بەرهەمەکانیشی، کە بۆ سەر زمانی فەرەنسەیی وەرگێردراون، خۆی راستەوخۆ هەڵەگیری کردوون.

---

(5) مێـژوو چـەیەکە، کـە (شـیللەر) لـەنێوان سـاڵانی ١٧٩١ز – ١٧٩٣ز – دا نووسـیبووی و نـاپلیۆن بـە پێچـەوانەی ئـەوەوە کـە خـۆی وا نیشـان دەدا، بـەڵام ئەوەنـدەش لـە بەرهـەمی نووسەرانی ئەڵمان بێ ئاگا نەبوو.

(1) Weimar: شـارێکی خۆرهـەڵاتی ئەڵمانـە و لەسـەردەمی دەسـەڵاتی (شـارڵ ئۆگۆسـت – ١٧٧٥ز – ١٨٣٨ز)دا، بووە جقاتی رووناکبیران و بەدەوری گۆتە –دا چالاکیان دەنوواند.

(2) muller – یوهـان فـون – ١٧٥٣ز – ١٨٠٩ز – مێـژوونووس و نووسـەری مێـژووی کونفدراسیۆنی (سویس)ە.

**ناپلیۆن**: هەتا لێرەن، دەبێ هەر شەوێك بچنە دیتنی شانۆنامەکانی لای ئێمە. پێشتان خراپ نابێ پیادەکردنی هەندێ لە شیوەننامە باشەکانی فەرەنسایی ببینن.

گۆتە: قوربان، من خۆم کارەم هەردەکرد و دەبێ لە حزووریشتاندا ددان بەوەدا بنێم کە خۆمیش ئەم مەبەستەم هەبوو، هەر خۆمیش چەند شانۆنامەیەکی فەرەنسایی، تەرجەمە، یان چاکتر بڵێم لاسایی کردۆتەوە.

**ناپلیۆن**: کامیان؟.

**گۆتە**: محەمەد و تانکەرید.

**ناپلیۆن**: دەنێرم لە (ریمهۆزا)[1] بپرسن کە ئاخۆ لێرە هونەرمەندی وامان هەن، کە ئەم شانۆنامانە بهێننە سەر شانۆ؟ زۆرم پێخۆشە کە پیادەکردنی ئەم شانۆنامانە، بەزمانی ئێمە ببینیت. ئێوە لە بارەی یاساگەلی شانۆوە، بە ئەندازەی ئێمە، تێبینی و وردەکاریتان نییە.

**گۆتە**: قوربان. لێرە لەبەرچاوگرتنی (یەکێتیگەل)[2] بە شتێکی بنەڕەتی دانانرێت.

**ناپلیۆن**: سەفەری ئێمە بۆ ئێرە، چۆن دەبینن؟

**گۆتە**: قوربان. یەکجار درەوشاوەیە و هیوادارم بۆ وڵاتەکەی ئێمە، بەخێر بگەڕێ.

**ناپلیۆن**: خەڵکەکەی ئێوە، بەختەوەرن؟.

**گۆتە**: ئومێدی زۆریان پێیەتی.

---

(1) Remusat – کۆنتس دو – نووسەری بیرەوەری لەبارەی ناپلیۆنی یەکەم و توێژەرەوەی ڕاهێنان و بارهێنانی ئافرەتانە.

(2) مەبەستی گۆتە، لە (یەکێتیگەل)، سێ یەکێتی: زەمەن، یەکێتی جێگە و یەکێتی ڕووداوە، کە لە ڕێبازگەی کلاسیکی فەڕەنسادا سێ ڕەگەزی بنەڕەتی پێك دێنن.

**ناپلیۆن**: جەنابی گۆتە، چاکتر وایە بەدرێژایی سەفەری ئێمە، لێرە بمێنیتەوە و ڕەنگدانەوەی ئەو (شانۆ پڕ سەروەرییەی ئێمە)[٣] بەرپامان کردووە، بخەنە سەر کاغەز.

**گۆتە**: ئاە. قوربان. بۆ ئەم کارە، قەڵەم توانای نووسەرێکی لە جۆری نووسەرە گەورەکانی سەردەمانی پێشینەی دەوێ.

**ناپلیۆن**: ئایا ئێوە لایەنگرانی (تاسیت)نین؟[٤]

**گۆتە**: بەڵێ. قوربان. دۆستیانم و زۆریش.

**ناپلیۆن**: بەڵام من، نەء!. چاکتریش وایە لێدوان لەم بارەیەوە بخەینە کاتێکی تر. بۆ جەنابی (ڤیلاند)یش بنووسە، کە بێتە ئێرە. منیش لە (وایمار) سەردانەوەی دەکەمەوە، چونکە شازادە (وایمار) ئێمەی بۆ ئەوێ بانگهێشتن کردووە. یەکجار تاسەی دیداری شازادە بانوی (وایمار) دەکەم. ئافرەتێکی زۆر شایانە. شازادەش خۆی، ماوەیەك بوو، ئاکاری نالەباری نیشان دەدا، بەڵام تەمێ کرا.

**گۆتە**: قوربان. ئەگەر نالەبارییشی کردبێ، تەمێکردنەکەی تاڕادەیەك ناڕەوایی تێدابوو. ئەگەرچیش من دەسەڵاتی داوەری کردنی ئەمجۆرە کارانەم نییە. بەڵام (وایمار) پارێزەری زانست و ئەدەب و فەرهەنگە و هەمووشمان دەبێ سوپاسی بکەین.

**ناپلیۆن**: جەنابی گۆتە. ئەمشەو بۆ سەیری شانۆنامەی (ئیڤی ژنی)[١] بێیت. شانۆ نامەیەکی باشە، بەمەشەوە هێشتا لەو جۆرە شانۆیانە نییە، کە لە هەموو

---

(3)مەبەستی ناپلیۆن لە (شانۆ نامەی پڕ سەروەری)، بە ڕواڵەت ئەو دیدارەیە، کە بڕیار بوو لە (ئێرفۆرت) لە نێوان ناپلیۆن و نیکۆلای یەکەم — تزاری ڕووسیا و چەندانێکی تر لە فەرمانڕەوانی ئەوروپادا ساز بکرێ.

(4) Tacite: مێژوونووسی ڕۆمی سەدەی یەکەمی زایینییە. نووسەری چەند بەرهەمێکی مێژوویی و بەرهەمی ترە، لەبارەی ئەڵمانەوە، گوتووبێژی وتار بێژان وجگە لەوەش شێوازی ڕەوانبێژیی، چڕ و پوخت و کورت نووسین، ئەمانە (تاسێت) یان بەناونیشانی یەکێك لە گەورە پەخشان نووسانی لاتینی ناساندووە.

شانۆنامەیەکم خۆشتر بوێت. بەڵام فەرەنساییگەل بایەخێکی زۆری بۆ دادەنێن. سەرەڕای ئەمەش، هەر لەم جێگەیەی مندا، گەلێ فەرمانڕەوایان و پاشایانی ئەورووپا دیویانە. ئایا (پرنس پریما) دەناسن؟.

**گۆتە**: بەڵێ. قوربان. ڕەنگە زۆر بە قوڵییش. چونکە (پرنس پریما) یەکجار هەست بەرز، زۆر بەڕێز و زۆریش دەستبڵاوە.

**ناپلیۆن**: چاکە. ئەمشەو دەیبینن چۆن سەری دەکاتە سەر شانی شازادە (ڤۆرتمبرگ)[٢] و دەچێتە خەوێکی خۆشەوە. ئەی تائێستا ئیمپراتۆری ڕووسیا ـ تان دیوە؟.

**گۆتە**: نەخێر، قوربان، هەرگیز. بەڵام هیوادارم پێیان بناسرێم.

**ناپلیۆن**: زمانی ئێوە، باش دەزانێ. ئەگەر بەرهەمێکتان سەبارەت بە ئەم دیدارەی (ئێرفۆرت) نووسیوە، دەبێ پێشکەشی ئەوانی بکەیت.

**گۆتە**: قوربان. من هەر بەم شێوە نەرێتە بیانیم. لەو کاتەوەی دەستم بە نووسین کردووە، لای خۆمەوە ئەو بڕیارەم داوە، کە هەرگیز پێشکەشنامە نەنووسم، تا هیچ کاتێ دوچاری پەشیمانیی نەبم.

**ناپلیۆن**: نووسەرانی گەورەی سەردەمی (لویی چواردەیەم) وا نەبوون.

**گۆتە**: ئەمە ڕاستە. قوربان. بەڵام ئاخۆ خاوەن شکۆ دەتوانن زامنی ئەوە بکەن کە ئەوانە هیچ کاتێ تووشی پەشیمانیی نەبووبن؟

**ناپلیۆن**: ئەی داروباری ئەو (کۆتز بۆی)[١] نائارامە بەکوێ گەیشتووە؟.

---

Iphigenie (1)، لە ئەفسانەی یۆنانیدا، ئاگامەمنوون ئەو کچەیە کە بۆ دڵنەوایی خواوەندان، باوکی دەیکاتە قوربانی، تا (با)ی پێچەوانە بۆ ڕاگرتنی پاپۆڕی یۆنانی هەڵبکەن. ئەم ئەفسانەیە بووە هەوێن بۆ شێوەننامە نووسی مەزنی یۆنانی کۆن: (ئۆریپید)، تا شێوەنامەیەك. بەناوی، (ئیڤی ژنی لە ئۆلیز) و (ئیڤی ژنی لە تۆریت)بنووسێ.

Wurtemberg: (2)میرنشینی پێشینەی باشووری خۆرئاوای ئەڵمانە. شازادە ڤۆرتمبرگ لەساڵی ١٧٠٥ز —دا نازناوی پاشایەتی درایە. ساڵی ١٨٧١ز — تا ساڵی ١٩١٨ز — بەشێك بوو لەئیمپراتۆریەتی ئەڵمان. لەساڵی ١٩٥١ز — بەدواوە، بۆتە پارێزگەیەکی ئەڵمانیای فیدراڵ.

**گۆته**: قوربان. دەڵێن لە (سیبریا)یە و ئەو خاوەن شکۆیە داوای لێبوردنی لە ئەلکساندەری ئیمپراتۆر بۆ دەکات.

**ناپلیۆن**: ئاخۆ دەزانن کە من جۆرە پەیوەندییەکی وام لەگەڵیدا نییە !

**گۆتە**: قوربان (کۆتز بوی) پیاوێکی یەکجار کلۆڵە و هەستێکی بەربڵاویشی هەیە.

**ناپلیۆن**: خواتان لەگەڵ، جەنابی گۆتە.

**ناپلیۆن**: ((لەلایەن منەوە سڵاوم بە جەنابی گۆتە بگەیەنن)).

ئەم ڕووداوی گوتوبێژە مێژوویی و دەگمەنەی لە سەرەوە بەرچاوتان کەوت، تایبەت بە ڕووداوەکانی ١٨٠٨ زاینیە. واتە: ئەو کاتەی کە ئیمپراتۆری فەرەنسە: ناپلیۆن بۆناپارت، لە لووتکەی دەسەڵات و ناوبانگیدا لە (ئێرفۆرت)ی ئەڵمانیا، خەریکی پێکهێنانی جۆرە کۆبوونەوەیەك بوو بە سەرانی وڵاتانی ئەورووپا. ئەم کۆبوونەوەیەش لە ڕاستیدا جۆرە خۆ نواندنێکی دەسەڵاتی سەربازیی و فەرەنگیی بوو، کە لە دیدی (ناپلیۆن)ەوە دەبوایە تواناو مەزنایەتی ئیمپراتۆرکەیان بە جیهان نیشان بدایە. لەم بانگهێشتنگەل و میوانداریی و خۆنواندنانەدا، چەندانێکی زۆر لە شازادەگەل، پاشایان، خانەدانان، فەرمانڕەوایان، بە شێوەیەکی گشتی، سەرومڕی دەشتنیشانکراوانی ناپلیۆن، کە بە نازناوگەلی بریقەدار و تەنتەنەوە دیاری کرابوون، ئامادەبوون. ئالکسەندەری یەکەم ـ تزاری سەرتاسەری ڕووسیاش ـ بۆ ئەم کۆبوونەوە شکۆدارە، بانگهێشتن کرابوو.

ڕۆژی دووەمی ئۆکتۆبەر، ناپلیۆن بانگهێشتنی نووسەر و شاعیری بەناوبانگی ئاڵمانی: (یۆهان ڤۆلڤانگ گۆتە)ی کردبوو، کە ڕەنگە هەر بۆ سەلماندنی ئەو جیاوازییە بەرچاوەش بێت، کە دەبێ لە نێوان گەورە ترین فەرمانڕەوای جیهان و گەورەترین کەسایەتی فەرهەنگی دا هەبێت، بۆیە خۆی پێشوازی (گۆتە)ی بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ کرد. بەمجۆرە لەسەرومڕی ماوەی گوتوبێژەکاندا، کە لە نێوان

---

– Kotzbue (1)ئۆگۆست فن – ١٧٦١ز – ١٨١٩ز – نووسەری ئاڵمانە، کە لە (وایمار) هاتۆتە دنیاوە. نووسەری شانۆنامەی پڕ لە ڕوداوە و لە ڕووسیا ژیاوە. بەڵام بە سۆنگەی بزێوی خۆیەوە، بۆ (سیبیریا) دوور خراوەتەوە.

ئەم دووانەدا ئاڵوگۆڕ کراوە، گۆتە لە بەرامبەر ناپلیۆندا ـ کە خەریکی نانخواردن بووە ـ بە پێوە وەستاوە و لە دەوروبەریشیاندا ژەنراڵان، وەزیران و نامەبەری ناپلیۆن لە هاتوچۆدا بوون.

نپلیۆن، بەڕستەی ستایش ئامێزی ئاوا پێشوازی نووسەری ناوداری ئاڵمانی کردووە: (یەك پیاوی تەواوە). لە ڕاستیشدا ناپلیۆن بڕوای وایە کە لەگەڵ گەورەترین شانۆنووسی ئاڵمانیدا سەروکاری هەیە. بەڵام نوێنەرانی فەرهەنگیی ناپلیۆن لە (بەرلین)، زانیاری ناڕاستیان پێگەیاندوو، چونکە سەرجەمی بەرهەمەکانی (شیللەر)ی دۆستی (گۆتە)یان داوەتە پاڵ (گۆتە)! هەڤپەیڤینی مێژوویی ئەم دوو کەسایەتییە، بە قسەی ئاسایی و بێبایەخ دەست پێدەکات... ناپلیۆن دەپرسێ:

«تەمەنتان چەندە؟». وەڵام:

«شەست ساڵ». ناپلیۆن:

«وا نایەنە بەرچاو. ئەی زۆرتر هەر شیوەننامە دەنووسن؟».

گۆتە نازانێ چ وەڵامێك بداتەوە و دوو دڵ دەمێنێ... ئەوسا ناپلیۆن سەبارەت بە «ئازارەکانی ڤارتەر ـی لاو» دەدوێ ـ ئەو ـ ڕۆمانە عاشقانەیەی کە بووە مایەی ناوبانگی جیهان داگری گۆتە ـ . لە هەمان کاتیشدا ئیمپراتۆر ئەوەی دووپات دەکردەوە، کە ئەم ڕۆمانەی، حەوت جار خوێندۆتەوە و تەنانەت لە کاتی لەشکرکێشی (میسر)یشدا لەگەڵ خۆی بردوویەتی... هەرواش بوو، ناپلیۆن بۆناپارت بە درێژایی لەشکرکێشییە درێژخایەنەکەی خۆی لە (میسر)دا، بووە مایەی سەرسامی هەندێ لە ژەنراڵەکانی خۆی.چونکە ئەوانە، ئیمپراتۆریان لە کاتی خوێندنەوەی هەمە جۆر ڕۆماندا، لە ناویشیاندا لە کاتی خوێندنەوەی (ڤارتە)ی گۆتە ـدا غافلگیر کردبوو... بۆیە هەردوای خوێندنەوەی ئەم ڕۆمان بووە، کە ئیمپراتۆر بەتوندی لە پێستی خۆی دەرچووە و بە رق و تووڕەییەکی فراوانەوە فرمانی دەرکردبوو، کە ئەمجۆرە ئەدەبیاتە (سووکە) کۆبکەنەوە، چونکە ناپلیۆن ئەوەی بە بەرەوە نەبوو، کە ژەنراڵان و سەرکردەکانی تریشی،

بکەونە ژێر زەبری کارتێکردنی ئەم شێوە ئەدەبەی، هەست و جوامێریی و پیاوەتی خۆیان لە دەست بدەن.

بەم حاڵەشەوە، ناپلیۆن بە بێ ئاماژەکردن بەم ڕووداوە، دەستبەرداری ئەوە نەبوو ڕەخنە لە ڕۆمانەکەی (گۆتە) نەگرێ، بەتایبەت لەو شتەی کە ناپلیۆن بڕوای وابوو دەبێتە مایەی پەرتبوونی بیر، لە ڕاستیشدا لە نێوان ئەو بەڵگەگەلە جۆراوجۆرەی ببوونە سۆنگەی خۆ کوشتنی (ڤارتەر)ی پاڵەوانی ڕۆمانەکەی (گۆتە)، بریندار بوونی شکۆمەندی و ئەو ئەوینەی (ڤارتەر) بوو، کە هەر بەناکامی مایەوە و بنەمای بنەڕەتیی ڕۆمانەکە، بوو... ڕەخنەکانی تری ناپلیۆن لەم ڕۆمانە، پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە ئەم دوو هەستە، لە بناغەدا، ناکۆك و دژی یەکن. (گۆتە)ش کە هەر لە بنەڕتدا بڕوای بە مشتومڕ و بەرپەچدانەوە نەبوو، وەڵامی دایەوە کە ئەم سەرنجە، بەجێیە و جێی وردبوونەوەیە. تەنانەت و تیشی ناپلیۆن یەکەمین کەسێکە سەرنجی ئەمی، بۆ ئەم ناکۆکییە ڕاکێشاوە.

دوای ئەوە، گوتوبێژەکە سەبارەت بە شانۆ بووە و ئیمپراتۆر بانگێشتنی (گۆتە)ی کردووە، کە هەمان شەو بچێت بۆ دیتنی شانۆ نامەیەك... ئەوسا کەمێك دواتر، ئاکاری نەوازش ئامێزی بەرامبەر (گۆتە) زیارتر دەبێ و پێی وتووە: ((وەرە بۆ پاریس))، کە ئەم بانگهێشتنەی ناپلیۆن، هەر لە ڕووی ڕێز و نەوازشەوە نەبووە، بەڵکو زەمینە خۆشکردن بوو، بۆ سەرەتای هێنانەدی بەرنامەیەك، کە ئیمپراتۆر لە مێشکی خۆیدا ڕەنگی بۆ ڕشتبوو... ناپلیۆن نیازی وابوو نەك هەر تەنیا وزە و هێزی سەربازیی و ئابووری، بەڵکو ڕووناکبیران و گەورە زانایانی زانست و ئەدەبیی ئەو سەرزەمینە، بەرەو پایتەختە ناودارەکە خۆی، جڵەوکێش بکات... ناپلیۆن بە جوانی و تەواوی لەو کەڵکە گەیشتبوو، کە بۆ دەستەبەرکردنی دەسەڵات، بەسەر مێژووی سەدەیەکدا، دەبێ لەگەڵ فەرەنگدا یەك بگرێ...

**((چارەنووس، واتا: سیاسەت)).**

چەند ڕۆژێ دوای دیداری گۆتە و ناپلیۆن، بەشدارانی کۆنگرەی جیهانی (ئێرفۆرت)، چوونە (وایمار). شازادەی وایمار، (پرنس شارل ئۆگۆست)، ڕاوێکی گەورەی لەسەر شەرەفی میوانە پایە بەرزەکانی خۆی ساز دابوو. چاوی تزار ئەلکساندەر، یەکجار نزیك بین بوو، لەبەر ئەوە دەبوایە (گای کێوی)یەکە، لە مەودای پێنج مەتری ئەوەوە، ڕاوبنێن، تا بتوانێ ڕاوەکە بکات!.

میوانداری درێژ و شەوانە، لە کۆشکی وایمار، ناپلیۆن هەمدیسانەوە گوتوبێژێکی کورتی لەگەڵ (گۆت)دا ساز کردەوە ـ ناپلیۆن ناوی (گۆتە)ی هەر بە (گۆت) بردووە ـ لەم گوتوبێژەدا ناپلیۆن سەبارەت بە (چارەنووس) قسەی کردووە و دەربڕینی ئەم واژەی (چارەنووس)ەی لە درێژایی مێژوودا بەو جۆرە یاد کردەوە، کە: (چارەنووس، مانای سیاسەت)ە.

بەڵام لە هەمان شەودا، درێژترین گوتوبێژ لە نێوان ناپلیۆن و (ڤیلاند)دا ڕوویدا، کە وتارێکی پوخت و کورت و بە زمانی فەرەنسەیی لە بارەیەوە ئامادە کرا. ڤیلاند دەیزانی کە ناپلیۆن بیروڕای ئەمی سەبارەت بە مێژوونووسی ڕۆمی: (تاسیت) مەبەستە، بە تایبەتی کە (تاسێت) بەشێکی گرنگی ناوبانگەکەی، هی ئەوە بووە کە بایەخی بە (سزار)ەکان نەداوە. ڤیلاند ـ یش لە بەرگری کردنی پڕ بەڵگەیدا لەسەر (تاسێت)، بە هیچ جۆرێ درێغی نەکرد. بەمجۆرە ئەگەر بۆ جارێکیش بووبێ، خۆی بە بەرزیوێکی جوامێر پیشان دەدا. بۆیە تێکڕای ئامادە بووان چەپڵەیان بۆ لێدان. سەرئەنجام کۆنگرەکە، بە بەخشین و پێشکەش کردنی خەڵاتێکی زۆر و مەدالیاگەلی جەنگیی ، دوایی پێهات.

* * *

ڕۆژی چواردەیەمی ئۆکتۆبەر، ساڵیادی داگیرکردنی بەناوبانگی (لینا)[1] بوو، ناپلیۆن ڕووە و پاریس، ئەڵمانیای جێهێشت، تا لەوێشەوە بۆ ئیسپانیا بچێ... لەوە بەدوا، نوقم و سەرقاڵی لەشکرکێشی تازە، شۆڕشگەلی تازە و جەنگی جۆراوجۆر بوو، کە ئیتر یادێکی لە (گۆتە) نەکرد... لەوە بەدواش یەکەمین تێشکانەکان و... ئاکامیش هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆرێتی دەستی پێکرد. ناپلیۆن لە کاتی بەپەلە گەڕانەوەشیدا لە ڕووسیاوە، لە یەکێك لە شارۆچکەکانی ئەڵمانیا، شەوێکی بەسەر برد. پرسی: «لەکوێم؟».

– قوربان وایت لە (وایمار).

بۆ سبەینێ، پێش ئەوەی لەوێ ببزوێ، بە خانەخوێییەکەی وت: «بچن سڵاوم بە جەنابی گۆت بگەیەنن». دەربڕینی ڕستەیەکی وا، لەو داروبارە دڵتەنگییەدا، لە لایەن (ناپلیۆن)ەوە، بەڵگەی ڕێزلێنانی ڕاستەقینەی بووە بۆ (گۆتە)، نەك ستایشکردن، کە دواتر مێژوونووسان بە پاڵیان داوە

**نیچە: «دیداری گۆتە لەگەڵ ناپلیۆن، دەبێ بە بڵندترین لووتکەی مێژووی جیهان بزانرێت».**

دیداری گۆتە و ناپلیۆن، کە لە دیدی زۆربەیەکی زۆری خەڵکی ئاڵمانیاوە، جۆرە ڕسواییەکی شەرم هێنەر، یان تا ڕادەیەك جۆرێك «خیانەتی نیشتمانی»یە، بەڵام لە دیدی (نیچە ـ نیتشە)ی بیردۆزی بەناوبانگی سەدەی نۆزدەیەمی ئاڵمانی یەوە: «بڵندترین لووتکەی مێژووی جیهان»ە. نیچە پێی وایە لە سەدەی نۆزدەیەمدا تەنیا دوو کتێب هەن: (بیرەوەریەکانی سەنت هێلن)[1] و (گوتوێژی گوتە لەگەڵ ئیکرمەن)[2]... نیچە، مەزنە پیاوە ڕاستەقینەکانی ئەورووپا، ئاوا

---

(1) Lena شارێکی خۆرهەڵاتی ئاڵمانە، کە ناپلیۆن لە (١٤)ی ئۆکتۆبەری (١٨٠٦ز)دا، لەشکری (پروس)ی تێدا تێکشکاند.

(1) مەبەست (بیرەوەرییەکانی ناپلیۆن بۆ ناپارت)ە، لەکاتی دوورخستنەوەیدا بۆ دوورگەی (سەنت هیلانە).

(2) Ecnkermann

بەئەژمار دێنێ: سزار، فردریکی گەورە، ناپلیۆن ، هۆمێر، ئەریستۆفان، لیۆنارد دافنشی و... گۆتە. هەروەها نیچە لە نێوان ((پێشینەی خۆی دا))، ناوی: هیراکلیتۆس، ئەمپدۆکلس، ئەسپنیۆزا و گۆتە ـش دێنێ.

دواتریش فەیلەسوفی ئاڵمانی: کارل یاسپرس[٣] وتوویەتی: ((گۆتە، بە بێئەوەی مۆدێل، یان سەرمەشق بێت، بۆ ئێمە جۆرێکە لە ڕێ نیشاندەر و جۆرێکە لە نموونەی باڵای مەرجگەلی مرۆڤایەتی.

(لودڤیك ڤان بێتهۆڤن)ی ئاواز دانەر و هاوچەرخی گۆتە، کە ئەویش بەرلەوەی ناپلیۆن تاج لەسەرنێ، بە نموونەی ڕەمزێکی شۆڕشگێڕ و ئازادیخوازی دادەنا و ساڵی ١٨٨٠ز ـ شیوەننامە بەناوبانگەکەی (گۆتە، بە ناوی (ئیگمۆنت)ی[٤] بە شێوەی ئۆپێرا دەرهێنا بوو، دیدارێکی تری دوو قۆڵییان لەگەڵ گۆتەدا هەیە، کە جیاوازیی ئەم دوو کەسە فەرهەنگی ـ مێژووییە بە ئاشکرا دەبینرێن... ئەم دیدارە لە بەرامبەر (ئیمپراتریسی نەمسا)دا بووە و شاعیری ئاڵمانی: خانم بەتینا برنتانۆ،[٥] کە لە هەمان کۆڕدا ئامادە بووە، ڕووداوەکانی ئەم دیدارەی ئاوا باسکردووە:

((... لە نێوان شەپولە خەڵکێکی پایەبڵندی نەمساوی و ئاڵمانی دا، کە ئاپوورەیان لە ئیمپراتریس کردبوو، گۆتە لە ناوجەرگە و جێی سەرنجی تێکڕای ئامادەبوواندا جێگەی دیار و بەرچاوی هەبوو. بە ئاکاری بەرز و خۆ بە کەمزانینەوە، سوپاسی ئەم بایەخ پێدانەی دەکرد. (بیتهۆڤن)یش کە لە کۆڕەکەدا ئامادە بوو، بە ئاشکرا ئەم شێوە ئاکارەی (گۆتە)ی پێناخۆش بوو، کە لە ئەنجامیشدا گرێی دڵی کردەوە و بەرەو ڕووی (گۆتە) وتی: ئەم جۆرە ئاکارەتان بە ئامانجی خۆتانتان ناگەیەنێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە. جەنابتان دەبێ ئەم کۆڕی پڕ باق بریقە، وا لێبکەن کە کەسایەتی گرنگ و تایبەتی تۆ، دەرك بکەن... ئەگەر وانەکەیت نازانرێ ئەمانە، چ جۆرە هەستێکی خۆیان نیشان دەدەن... بڕوانە لەم

(3) Carl Jaspers
(4) Egmontn
(5) Betina Brentano

بوارەدا من چیم کردووە: بڕیاربوو دەرسی (پیانو) فێری (ئەرشیدۆك رۆدلَف) بکەم، ئەویش وای بیر کردبۆوە، کە ئەگەر ماوەیەگك لە ژووری چاوەڕوانییەکەیدا ڕامبگرێ، خراپ نابێ. دوایی هەر ئەوەندەی لە پشت پیانو ـکەوە دانیشت، وام لێکرد بەجۆرە پەلەپەلێك پیانو ـکە بژەنێ، کە سەری هەموو قامکەکانی ژانیان گەیشتێ. ئەرشیدۆك بێزاریی پێوە دیاربوو، هۆی ئەو هەموو پەلەپەل و کەم چیکەلّدانییەمی لێ پرسیم. منیش لە وەلامدا پێم وت: کە ئەو ئەوەندە منی لە ژووری چاوەڕوانییەکەیدا ڕاگرتووە، کە ئیتر ماوەی کات بە فیرۆدانم نییە و دوایی تێم گەیاند کە مەبەست لەو ڕاگرتنەم، بە دلّنیاییەوە هەر خۆ دەرخستن و خۆ نواندن بووە و پێشم وت: ((ئەو مەدالیا و خەلاتەی ئێوە، بەم و بەوی دەبەخشن و بە ڕوالّەت بەرزیان دەکەنەوە، ناتوانن کەسایەتییان بۆ دروست بکەن. ئێوە دەتوانن وەزیرێك، یان کەسێکی خاوەن پلەوپایە دروست بکەن، بەلاّم نەك (گۆتە)یەك، نەك (بیتهۆڤن)ێك. ئەمە حەقیقەتێکە کە ئەوان ناتوانن خەلّکی وەك ئێمە دروست بکەن و خۆیشیان بە هەموو دەسەلاتیانەوە، توانای دروستکردنی خەلّکی وەك ئێمەیان نییە. لەبەرئەوە، دەبێ ئەوان، ڕێز لە ئێمە بگرن.

گۆتە و بێتهوڤن سەرقالّی قسەکردن بوون، کە ئیمپراتریس و ئارشیدۆککگەل و یاوەرانیان گەیشتن. بیتهوڤن بە گۆتە ـی وت: ((قۆلّت لە قۆلّی مندا بێت و لێم جۆی مەبەرەوە، چونکە دەبێ ئەوان بچنە کەنار و ڕێگە بۆ ئێمە بکەنەوە)).

بەلاّم گۆتە، کە نێوانی لەگەلّ ئەم جۆرە بیرکردنەوانەدا نەبوو، کەمێك ڕەنجاو لە حالّێکدا کە قۆلّی خۆی لە قۆلّی بیتهوڤن دەرهێناو کلاّوە مووییینە ڕەسمییەکەی خۆی لەسەری داگرت و بە ئەدەبێکەوە لەسەر ڕێی ئیمپراتریس و یاوەرانی، دوور کەوتەوە و چووە کەنار. کەچی بیتهوڤن بە پێچەوانەوە، لە حالّێکدا کە هەردوو دەستی لە پشت خۆیەوە هەلّپێچابوو، بە ئاماژەیەکی نادیاری شێوە سەلامێك، لە نێوان پۆلی خانەدان و دەربارییاندا، بەڕێی خۆیدا ڕۆیشت. ئەوانیش بەسەر دانەواندنی ڕێز ئامێزەوە، لەسەر ڕێیەکەی لاچوون و چوونە کەنارەوە... دوایی بیتهوڤن ڕاوەستا، تا (گۆتە) پێی بگاتەوە کە هەر بەو جۆرە بەرامبەر ئامادەبووانی ناو کۆڕەکە، سەری دەلەقاند. کاتێکیش کە (گۆتە)ی

گەیشتێ، بیتهوڤن پێی وت،: ((چاوەڕێتان بووم، چونکە ڕێزی زۆرم بۆتان هەیە و جەنابیشتان هەر شایانی ئەو جۆرە ڕێزەن، بەڵام بەڕاستی لە ڕادەبەدەر ڕێز بۆ ئەوانە دادەنێیت)).

## گۆتە کێیە و چی کردووە؟

((من، ڕۆژی بیست و هەشتەمی ئوت ١٧٤٩ز ـ لە (فرانکفۆرت)، لەگەڵ لێدانی زەنگی نیوەڕۆدا لە دایکبووم. بەڵام بەهۆی نەشارەزایی مامانەکەمەوە وەك شێوە مردوویەك پێم نایە جیهانەوە)).

گوتە، شاعیر، نووسەر و ڕووناکبیری ئاڵمانی، لە ژیننامەی خۆیدا، کە خۆی نووسیوێتی، شێوەی هاتنە دنیای خۆی بەو چەند وشەیەی سەرەوە دەست پێکرددوە. دایکیشی دەڵێ: ((ئەو کاتەی لە دایکبوو، وەك مردوو وابوو، بچووکترین نیشانەی ژیانی تێدا نەبوو. ئێمەش تۆسقاڵێ هیوامان بەم کۆرپە مردووە نەبوو، چاو بە ژیاندا هەڵبێنێ)). کۆرپەی شین هەڵگەڕاو و نەفەس گیراو، دوای شێلان و دەست پێدا هێنانی سەردڵی، ژیانی تێهاتەوە و دواتر ناونرا: ((ڤۆلڤانگ ـ ڤۆلڤانگ گوتە)).

لەمساڵەوە: ١٧٤٩ز ـ تا ساڵی ١٨٣٢ز ـ کە گۆتە لە (٨٣)ساڵیدا چاو لە جیهان لێك دەنێ، بەرهەمێکی زۆری بە شیعر و پەخشان ئەفراندووە و ئەم بەرهەمانە، گۆتە ـ یان بە یەکێك لە بەهرەوەرترین و پڕ خرۆشترین کەسایەتییەکی تاقانەو بێ وێنەی فەرهەنگی سەدەکانی مێژووی ئەوروپا، بە ئەدەبیات و فەلسەفەی ئاڵمان ناساند.

لە نێوان بەرهەمە جۆراوجۆرەکانی گۆتەدا، جگە لەو نووسینانەی ناوی ناون: ((بەرهەمی سەردەمی لاوێتی))، دەتوانین ناوی (ئازارەکانی ڤارتەر) بهێنین، کە ڕۆمانێکی پڕ سۆزە و لە تەمەنی (٢٥) ساڵیدا، نەك هەر لە جیهانی ئەدەبدا، بەڵکو لە جیهانی فەلسەفە و سیاسەتیشدا دەنگدانەوە و ناوبانگی بەربڵاوی بۆ گۆتە پەیداکرد.

لە ساڵی ١٧٧٩ز ـدا، ئیلهامی لە شانۆ نووسینی بۆنانی کۆن (ئۆرپید) وەرگرت و شانۆنامەی (ئیڤی ژنی) لە (تۆرید) نووسی و دواتر لە ساڵی ١٧٨٧ز ـدا بە شێوەی شیعر نووسی. (ئەگمۆنت) بەرهەمێکی تری بوو، کە پڕ بوو لە خرۆشان و هەڵچوون و هەستی مرۆڤانە و نیشتمانییانە و ئیلهامەکەی لە جەنگەکانی جیابوونەوەی هۆڵەند، دژی هێرشکارانی ئیسپانیا وەرگیرابوو، دواتریش مۆسیقازانی ناوداری ئاڵمان (بیتهوڤن) کردیە هەوێنی یەکێك لە ئۆپێرا بەناوبانگەکانی خۆی..

((ساڵانی مەشق بینین و گەشتوگوزاری ویلهام مایستەر))یش ناونیشانی بەرهەمێکی تری گۆتە بوو، کە ساڵی ١٨٠١ز ـ نووسی و لە شێوەی ڕۆمانێکی لەبارەی جیهانی شانۆ و گەشتی شانۆیی تیپێکی شانۆییدا پیشان درا. بەڵام باس و خواسی هەمان ڕۆمان، وردەوردە لە ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدیبان و بیردۆزانی سەردەمدا، بە شێوەی مەسەلەیەکی فەلسەفی کەوتەوە و بووە پێوانە بۆ گۆڕانی قۆناغەکانی ژیانی ئادەمیزاد و بۆ ئەوە دەشێ لە داهاتوودا بکرێتە سەرمەشقێکی هەمیشەیی.

((قەشەگەلی سەرکەوتوو))[٦]، ناونیشانێکی سەیری بەرهەمێکە، کە گۆتە لە ساڵانی پیریدا (١٨٠٨ز ـ ١٨٠٩ز)دا نووسی و بابەتەکە هەر لە سەرەتاوە ستایشکردنی زانستی تازەیە... بەڵام بەناوبانگترین بەرهەمی گۆتە، دیارە هەر (فاوست)ە[٧]، کە لە درێژایی تەمەنیدا هێلانەی لە مێشکیدا کردبوو. دکتۆر فاوست: زانا، زانای ئایینی، مامۆستای زانستگەلی شاراوە، ئەستێرەناس، کیمیاگەر و فەیلەسوفی فەیلەسوفان، کە لە ڕاستیدا ئەفسانەی لاوێکی نەمر و ئەفسانەی هەڵچوونی ئادەمیزادە لە دژی سنوورە سرووشتییەکانی مرۆڤ، کە لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە بەردەوام لە ئەوروپادا بە شێوەیەکی جۆراوجۆر لە بەرهەمی فەلسەفی و ئەدەبیدا ڕەنگی داوەتەوە. دکتۆر فاوست ـ ی گۆتە، لەگەڵ ئەوەشدا پارێزگاری بەشێك لە تایبەتمەندگەلی ئەم ئەفسانە ڕەگ و ریشەدارەی

---

(6) Die Wahle Wandschaften

(7) Faust

کردووە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا و لە ڕاستیدا، بەرجەستەکردنی ئاڵۆزی و دوو دڵی و پەژارەی ناوەوەی مرۆڤی سەردەمی نوێیە لە بەرامبەر توانای زۆری زانست و هۆش دا. یان بەواتەیەکی تر: جۆرە ململانێیەکی دەروونییە، لە نێوان جیهانی هەست پێکراو و سنووردار لە لایەکەوە و لەلایەکی تریشەوە جیهانی نەبڕاوەی سرووشتی بێ سنوور و نەمردا.

جگە لەم کارانە، گۆتە بەرهەمێکی تری ئەدەبیی هەیە، کەلە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بە گشتی و لای دۆستدارانی ئەدەبی فارسی بە تایبەتی ناسنامەی مەزنایەتی گۆتە ـیە. ئەو بەرهەمەش تەرجەمەکردنی شیعری شاعیری نەمری ئێپرانی (حافزی شیرازی )یە، کە بە توانا و سەلیقە و زمانێکی زۆر شاعیرانە، وەرگێڕاونەتە سەر زمانی ئاڵمانی.

ناپلیۆن بۆناپارت، کە لە (ئازارەکانی ڤارتەر ـی لاو) و خۆ کوشتنی عاشقانەی بە سووك و ناشایستەی شان و شکۆی پیاوانی ڕاستەقینە زانیوە، ڕۆژگار ئەوەندەی مەودا و دەرفەت نەداوە، تا (فاوست)ی گۆتە بخوێنێتەوە و سەرنج لەبارەیەوە دەرببڕێ. کەچی (هێتلەر) بە ئاشکرا وتی: «من زۆر گۆتە ـم پێخۆش نەبووە، بەڵام لێی دەبوورم چونکە بیستوومە وتوویەتی ـ کار، سەرەتای هەموو شتێکە». هەر ئەمەش بووە هۆی پاراستنی بەرهەمە موعجیزە ئاساییەکانی لە بەرامبەر هەموو قەلاچۆکردنێکی ئەڵمانیای نازی دا.

**ڕووداوەکانی سەردەمی گۆتە، لە ڕۆژانی لەدایکبوونییەوە تا مردنی:**

شۆڕشی گەورەی فەرەنسە، داگیرکردنی وڵاتان لەلایەن ناپلیۆن ـەوە، لەبەریەك هەڵوەشاندنی ئیمپراتۆریێتی ناپلیۆن و گەڕانەوەی دەسەڵات بۆ بنەماڵەی (بۆربۆن)... ئەمانە ڕووداوە گرنگەکانی سەردەمی ژیانی گۆتە بوون و ئەویش لەگەڵ ئەدیبە دەگمەن و ناوازەکانی سەردەمی خۆی بوو، کە وەك کێوێك لە بەرامبەر شەپۆلی خرۆشاوی زەریای ڕووداوەکاندا، مایەوە.

١٧٤٩ز ـ لەدایکبوونی گۆتە. کۆتایی هاتنی جەنگی جێنشینی لە نەمسا (ئوتریش).

١٧٥٥ز ـ بوومەلەرزەی گەورەی لیسبون (پورتەغال).

١٧٥٦ز ـ دەست پێکردنی شەڕی حەوت ساڵە.

١٧٦٣ز ـ نووسەری ناوداری فەرەنسە: ژان ژاك رۆسۆ، بەرهەمە ناسراوەکەی خۆی: (بڕیارنامەی کۆمەڵایەتی) بڵاوکردەوە.

چوونە سەر تەختی کاترینی دووەم لە ڕووسیا.

١٧٦٣ز ـ بە گوێرەی پەیماننامەی پاریس، ئینگلستان خاکی کانادا و لویزانا لە فەرەنسە و فلۆریدا لە ئیسپانیا وەردەگرێتەوە.

١٧٧٠ز ـ دەرکەوتنی یەکەمین چوارچەی مۆتۆڕدار لە فەرەنسە.

١٧٧٥ز ـ دەست پێکردنی جەنگی سەربەخۆیی لە ئەمەریکا.

١٧٨١ز ـ ئیمانۆئێل کانت (ڕەخنەی عەقڵی ڕووت)ی بڵاوکردەوە.

١٧٨٣ز ـ بە گوێرەی پەیماننامەی (ڤەرسای)، ئینگلستان بە شێوەیەکی ڕەسمی، سەربەخۆیی شوێنە داگیرکراوەکانی خۆی ڕاگەیاند.

١٧٨٧ز ـ پێکهێنانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

١٧٨٩ز ـ گرتنی بەندیخانەی (باستیل) و دەست پێکردنی شۆڕشی گەورەی فەرەنسە.

١٧٩٢ز ـ دەست بەسەراگرتنی کۆشکی سەڵتەنەتی (تویلەری) لە پاریس و راهێشتنی بانگی ڕژێمی کۆماری فەرەنسە.

١٧٩٣ز ـ سەرەتای (سەردەمی ترس و بیم) لە فەرەنسە.

١٧٩٦ز ـ لەشکرکێشی ناپلیۆن بۆ سەر ئیتاڵیا.

١٧٩٩ز ـ لەشکرکێشی ناپلیۆن بۆ سەر میسر.

١٨٠٠ز ـ ئەلکساندەر ڤۆڵتا، یەکەمین پیلی ئەلەکتریکی دروستکرد.

١٨٠٣ز ـ بە گوێرەی پەیماننامەی (ئامی ێین)، ئینگلستان چاوپۆشی لە تێکڕای ئەو وڵاتانە کرد، کە داگیری کردبوون.

١٨٠٤ز ـ ناپلیۆن بەناونیشانی ئیمپراتۆرە تاجی لەسەر نراوە.

١٨٠٥ز ـ سەرکەوتنی پاپۆڕی ئینگلستان لە (تراڤاڵگار). سەرکەوتنی ناپلیۆن لە شەڕی ئوستەرلیتز (ئوتریش). هەرەسهێنانی ئیمپراتۆرێتی ئاڵمانیا. ناپلیۆن نازناوی پاشای ئیتالیا بە خۆی دەسپێرێ و بۆ ئەمەش لە جیاتی خۆی، جێگرێك دیاری دەکات.

١٨٠٦ز ـ پێکهێنانی کۆنفراسیۆنی (راین) و پەیمانی شانزە پاشای ئەڵمانیا، تا لەگەڵ ناپلیۆن دا ببنە یەك.

١٨٠٧ز ـ پەیمانی (تیلیسیت) لە نێوان ناپلیۆن و تزاری ڕووسیادا. پرووسیا لە لیستەی زلهێزەکانی ئەوروپادا دەسڕێتەوە.

١٨٠٨ز ـ لەشکرکێشی ناپلیۆن بۆ سەر ئیسپانیا.

١٨١٠ز ـ دامەزراندنی زانکۆی بەرلین.

١٨١٣ز ـ نەمسا، پرووسیا و ڕووسیا یەك دەگرن و لە (لایبریگ) ناپلیۆن دەشکێنن.

١٨١٤ز ـ کۆنگرەی (ڤییەنا).

١٨١٥ز ـ بەزینی ناپلیۆن لە (واتەرلو). پێکهێنانی (یەکێتی پیرۆز) دژی فەرەنسە.

١٨٣٠ز ـ یەکەمین زنجیرەی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە، لە ئیتالیا.

١٨٣٣ز ـ نیشتمان پەروەرانی یۆنان، سەربەخۆیی خۆیان ڕادەگەیەنن.

١٨٣٨ز ـ جەنگی ڕووسیا و تورکیا.

١٨٣٠ز ـ شۆڕشی ژویە لە فەرەنسە.

١٨٣١ز ـ مۆرکردنی یاسای بنەڕەتی دژی دەسەڵاتی چەوسێنەری بەلژیك.
١٨٣٢ز ـ ئاڵوگۆڕی چاکەکاری، لە پەرلەمانی ئینگلستاندا. مردنی گۆتە.
***

دەقی ئەم گوتوبێژە، لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە: گۆتە ـ کۆمەڵە گەورەپیاوانی ئەدەبیاتی جیهان ـ پەخشنامەی پاری. ماچ، پاریس ـ ١٩٧٠
گۆڤاری (نامەء فرهنگ) ژمارە ٢٤ی زستانی ١٣٧٥ هەتاوی ـ ساڵی شەشەم ـ لاپەڕەکانی ١١٨ — ١٣٥ دکتۆر (ناسر موفەقیان) کردوویەتی بە فارسی.

* * *

## بەرهەمی چاپکراوی نووسەر

١. ژووان، شیعر، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، (١٩٨٠).
٢. گەشتی ریچ بۆ سلێمانی، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، بەرگەلوو، (١٩٨٤).
٣. کێشەی کورد، وەرگێڕان چاپی یەکەم، یاخ سەمەر، (١٩٨٦).
چاپی دووەم، ئێران، تەورێز، (١٩٩٠).
چاپی سێیەم، هەولێر، (١٩٩٢).
٤. گوڵەکانی دۆزەخ، شیعر، چاپی یەکەم، ئێران، تەورێز، (١٩٩٠).
چاپی دووەم، هەولێر، (١٩٩٢).
٥. گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، ئێران، تەورێز، (١٩٩٢).
چاپی دووەم، ئێران، تەورێز، (١٩٩٥).
چاپی سێیەم، هەولێر، (٢٠٠٢).
چاپی چوارەم، هەولێر، (٢٠١١).
٦. ئەفسانەی ئەدونیس، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، ئێران، تەورێز، (١٩٩٤).
٧. گۆرانی کوردی، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، ئێران، تەورێز، (١٩٩٤).
٨. مێژووی مۆسیقای کوردی، چاپی یەکەم، ئێران، شەهری کورد، (١٩٩٤).
چاپی دووەم، هەولێر، (٢٠٠٢)، دەزگای ئاراس.
چاپی سێیەم، هەولێر، (٢٠٠٨)، دەزگای موزیك و کەلەپووری کورد.
چاپی چوارەم، هەولێر، (٢٠١٣)، دەزگای موزیك و کەلەپووری کورد.
٩. سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانی، چاپی یەکەم، هەولێر، (١٩٩٨).
چاپی دووەم، هەولێر، (٢٠٠٢)، دەزگای ئاراس.
١٠. راوە گزنگ، وتار و رەخنەی ئەدەبیی، چاپی یەکەم، هەولێر، (١٩٩٨).
١١. بیرەوەرییەکانی وەفایی (تحفه المریدین)، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، (١٩٩٩). ،چاپی دووەم ، هەولێر، (٢٠١١).
١٢. کەروێشکی زیرەك و گورگی دانا، چیرۆکی منداڵان، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، سلێمانی، (٢٠٠٠).

١٣. شۆرشی شیخ عوبەیدوڵڵای نەهری، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، چاپەمەنی موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٠).

١٤. میرنشینی ئەردەڵان، بابان، سۆران، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٠).

١٥. راپەڕینی هەمزائاغای مەنگور، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٠).

١٦. کەروێشك و تانجی، چیرۆکە شیعر بۆ منداڵان، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٥).

١٧. دیوانی ئەدەب (عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان)، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٦).

١٨. أفتتاح ناسری، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، نووسینی عەلی ئەکبەر سەرهەنگ، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٧).

١٩. شۆرشی شیخ عوبەیدوڵڵای نەهری، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، نووسینی عەلی خان گۆنەخان ئەفشار، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٧).

٢٠. شۆرشی شیخ عوبەیدوڵڵای نەهری، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، ئینگلیزی و ئەمەریکاییدا، نووسینی وەدیع جوەیدە، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٧).

٢١. شۆرشی شیخ عوبەیدوڵڵای نەهری، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، نامەی دەرباری و سەربازییانە. نووسینی حەسەن عەلی خان، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٧).

٢٢. شۆرشی شیخ عوبەیدوڵڵای نەهری، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، بەڵگەنامەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٧).

٢٣. شۆرشی شیخ عوبەیدوڵڵای نەهری، لە بەڵگەنامەی ئەرمەنیدا، نووسینی ئەسکەندەر غۆریاس، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٧).

٢٤. موزیك و گۆرانی کوردی، کۆمەڵە وتار، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠١١).

٢٥. بیرەوەرییەکانی د. سەیید عەزیزی شەمزینی (ئامادەکردن و پەراوێز بۆ نووسینی) محەمەد حەمەباقی.

٢٦. سەفەرنامەی ژان ئۆتەر، وەرگێڕان لە فارسییەوە، خانەی موکریانی، هەولێر (٢٠١٣)

٢٧. ئەدەب و مێژوو (کۆمەڵێك وتاری ئەدەبی و بەڵگەنامەی مێژوویی)

## بەرهەمی داهاتوو

١- مەولانا خالید ـ خوێندنەوەیەکی نوێ

٢- مەولەوی تاوەگۆزی ـ خوێندنەوەیەکی نوێ

٣- سمکۆی شکاك ـ لە بەڵگەنامەی ئێرانیدا

٤- نامە و بەڵگەنامەی بەجێماوی عەبدللابەگی میسباح دیوان ـ ئەدەب.

٥- چاپی نوێی دیوانی عەبدللابەگی میسباح دیوان ـ ئەدەب.

٦- دیوانی مەولەوی تاوەگۆزی

٧- کورد لە سەفەرنامەی بیانیدا

٨- بیرەوەرییەکانی لیێتن ـ کونسوڵی ئەڵمانیا لە تەورێز ـ ١٩١٤

٩- مەولەوی رۆمی ـ بەسەرکردنەوەی ژیان و بەرهەمی

١٠- کورد لە بەڵگەنامەی ئێرانیدا

١١- کۆمەڵێك بەرهەمی وەرگێڕدراو ـ لە فارسی و عەرەبییەوە.

١٢- نالی و زمانی نالی ـ خوێندنەوەیەکی نوێ